




رۆمانو و فلاڤیا پرۆدی

# سیاسەتی دڵ

وەرگێڕانی: شێرزاد هەینی





# سیاسەتی دڵ

رۆمانو و فلاڤیا پرودی

وەرگێڕانی: شێرزاد هەینی

ناوی کتێب: سیاسەتی دڵ "ڕۆمانو و فلاڤیا پرودی"
وەرگێڕانی بۆ عەرەبی و ئامادەکردنی: سەلیمە لبال
وەرگێڕانی بۆ کوردی: شێرزاد هەینی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٧٠
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + تریسکە ئەحمەد
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر - ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢١٨ی
سالی ٢٠١٠ی دراوەتێ

## پێڕست


پێشەکی ........................................ 9

بەشی یەکەم - سەرۆک وەزیران لە هەتیوخانەیەک گەورە بووە ........................ 11

بەشی دووەم - کە پیاوەکە دەبێتە وەزیری پیشەسازی ژنەکە... ........................ 21

بەشی سێیەم - پەیمانی ئولیفۆ لە ساڵی ١٩٩٦ رۆمانو... ........................ 33

بەشی چوارەم - پرودی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ رۆژنامەنووسان... ........................ 44

بەشی پێنجەم - کە فلاڤیا شادوری ئێرانیی پۆشیوە ئیتاڵییەکان... ........................ 51

بەشی کۆتایی - ئەو بەردەوام لەگەڵ ئەوەدا بووە رەگی کریستانیەتی... ........................ 63




بەرگی کتێبەکە بە زمانی فەرەنسی

ئەو کتێبە ڕۆژانەی ژن و مێردەکە لە ئیتاڵیا ڕۆڵیان لە سیاسەتی نوێی وڵاتەکەیان گێڕاوە و پەنجەرەیەکە بۆ بینینی گۆڕەپان و ماڵ و بەرنامەی سیاسەتمەداران.

# پێشەکی

لە زێدی خۆیان ئەو دوو کەسە یەکتریان ناسیوە، لە کۆتایی شێستەکانی سەدەی رابردوو و لە کۆتایی شێستەکاندا بەیەکەوە ئەزموونی ژیانی زانکۆییان لە وڵاتی ئیتالیایان دیوە، فلاڤیا فرونزونی و سەرۆک وەزیرانی پێشووی ئیتاڵی رۆمانو پرودی لە ساڵی ١٩٦٩ پرۆسەی هاوسەرگیرییان بەیەکەوە کردووە.

ژنەکە فلاڤیا لەبەر چالاکییەکانیدا دەبێتە سەرچاوەی جیهانی (تەکوین)ی کۆمەڵایەتی لە ئیتاڵیا و رۆمانوش لە هەڵبژاردنی مانگی ئەپریلی ساڵی ٢٠٠٦ چاوی سیلڤیو برلۆسکۆنی خاوەن ئیمپراتۆرییە ئابووری و راگەیاندنەکە دەشکێنێت، بە بەرنامەکەی خۆی و پاش هەڤاڵبەندیی لەگەڵ (یونیون)دا دەنگەکانی دەستەی دەنگدەرانی ئیتاڵی و لە پاش ماوەیەکی درێژ لە کارکردنی لە زانکۆدا وەک مامۆستایەکی ئابووری هەڵبژاردنەکە دەباتەوە. لە ماوەی مانگی مایۆی ساڵی ١٩٩٦ تا مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٨ لەگەڵ هەڤاڵبەندەکانی بەناوی (ئۆلیڤۆ) لە چەپە ناوەندەکانەوە دادەمەزرێنێت و دەبێتە سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیا، ئەو پێنج ساڵیش سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئەورووپی دەبێت کە لەو ماوەیەدا کاری زۆری کردووە بۆ یەکێتی جوگرافی و دراوی پاش ئەوەی ژمارەی دەوڵەتەکانی ئەندام دەگاتە ٢٥ دەوڵەت و دراوی یۆرۆش دەبێتە تاکە دراوی یەکگرتوویان لەو وڵاتانەدا. ئەو کتێبەی ئیمرۆ رۆژنامەی ئەلقەبس ئامادەی کردووە و بەزنجیرە بڵاوی دەکاتەوە لە سەرەتادا بیرۆکەی ژنەکە فلاڤیا بووە، ئەو ژن و مێردە کە ماوەیەکی زۆر لە کاروانی خەباتیان بۆ دەربازبوونی وڵاتەکەیان لە تەنگژە ئابوورییەکە کە چەندین ساڵ لەبەریان نالاندوویانە هاوشان بووینە، ئەو رەوشە نالەبارە ئابوورییەکەش

هەمـوو بەرەنجـامی ئەو گـەندەڵـیـیـە بووە کـە وڵاتەکـەی تـەنیـوەتـەوە و لە ناو دەسـەڵاتدارەکاندا زۆر باو و کـارکـەر بووە، بەیەکـەوە کاریان کـردووە بۆ ئەوەی سـیـمـای وڵاتەکـەیان گـەشـاوە بێت، بەڵام بـە هـاتنی برلـۆسکۆنی بـۆ پۆسـتـی سـەرۆکـایـەتیی وەزیران دیاردە قـێـزەونەکـەی گـەندەڵـی گـەڕاوەتـەوە ئیـتـاڵیـا. سـیـاسـەتی دڵ کـۆکـراوە و شـەهادەی ئەو ژن و مـێـردەیە کـە سـاڵەکـانی خوێندنیان لە زانکۆ ئەوانی کۆ کردیتەوە و سـیاسەت و تەنگژەکانی ئیتاڵیاش زۆرتر کـارکـەری کـردوون، ئەوەش ئێسـتـگەیەکە سـەرۆک وەزیرانی پێـشـووی ئیتاڵی لەگەڵ هاوسەرەکەی تێدا گوزەریان کردووە و لێرە دەبێتە سەرچاوەیەک بۆ خوێندنەوەی دۆزینەوەی بەشێکی کیشوەری ئەورووپا.

# که جەنگی دووەمی جیهانی برسییان دەکات
# دایکی لە ئیتاڵیا نارِوات

من لەگەڵ رۆمانو ماوەی سی و شەش ساڵە، ساڵانە پشووی وەرزی هاوینەمان لەو خانووە بەسەر دەبەین، کە دەکەوێتە سەر بەرزاییەکی تەنیشت ریژیو ئیمیلیا لە باکوری ئیتاڵیا، خانووەکە گەورەیە و بۆیەش جێگەی شێست کەس دەبێتەوە، ماوەیەکی باشە خوومان بەو هەوارە گرتووە و جەژنی سەرەساڵی تێدا دەکەین، لە ساڵی ٢٠٠٤ ژمارەمان لەو ئاهەنگە و لەو خانووەدا گەیشتبووە حەفتا و سێ کەس، ئەوەش مانای ئەوە نییە هەموو ئەندامانی خێزانەکەمان ئامادە بوون، بگرە زۆریشیان نەهاتبوون، ژمارەیەکیان بۆیان ساز نەبووە لەو بۆنەیەدا ئامادە بن، چونکە ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەمان دەگاتە سەد کەسێک ئەگەر هەموویان بتوانن ئامادە بن.

خێزانی رۆمانو گەورەیە، ئەوان حەوت برا و دوو خوشکن و یەک لە دوای یەک لەدایک بوون، ماوەی نێوانیان کەمە، هاوسەرەکەی من ژمارەی هەشتەمە، بۆیەش دایکی پیاوەکەم کە ناوی (ئەنریکا) بووە بۆ پەروەردەکردنی ئەو منداڵانە ناچارە واز لە مامۆستایەتییەکەی خۆی بهێنێت و خەریکی منداڵە زۆرەکانی بێت، باوکی ئەو لە ناو بنەماڵە جووتیارەکەیان تاکە کەس بووە خوێندنی تەواو کردووە و بوویتە ئەندازیاری دەڤەرەکەیان.

هاوسەرەکەم رۆمانو دوو رووداوی باوکی دەگێرِێتەوە و هەرگیز لە بیری ناچێت، یەکەمیان باوکی کە بۆ خوێندنی زانکۆ لە ماڵەوە دەرچووە، نەک پارەی خەرجییەکانی لە ماڵەوە وەرنەگرتووە، ئەو لە جیاتی ئەوەی لە کار و

مـــاڵەوە دوور کـــەوتووتەوە مـــانگانە پارەی بۆ رەوانـە کـــردوون، چونکە ئەو تاکەکەس بووە لـە مـاڵەوە کـاری نەکـردووە، دووەمـیـان کـە بەردەوام رۆمـانو دەیگێڕێتەوە ئەوەیە کەوا ئەو لە پاش کۆتاییی جەنگی دووەمی جیهانیدا شەش مانگ کاری زیادەی کردووە تا دەرخستەی ئاراستەکانی هێڵی ئاسنیی نێوان ڤیرون و پۆلۆنیای ئیتاڵیا دەراسەت بکات. ئەو بنەماڵەیە لە رۆژانی جەنگەکە رەوشـــیـــان باش بووە و گـــوزەرانـیـــان باش بـووە، بەڵام لەگـــەڵ رۆژگـــاردا رەوشەکەیان دەگۆڕێت و باوکی ناتوانێت تا سەری مانگ مەسرەفەکان بکات، بۆیە کـەسـە نزیکەکانی ئامۆژگـاریی دەکەن بۆ کارکـردن کۆچی ئۆرۆگـوای بکات، بەڵام هـاوسـەرەکەی ئەو پێشـنـیـازە قـبـووڵ نـاکـات و لەگەڵ مێـردەکەی ناڕوات و لە ئیتـاڵیا دەمێنێتەوە و بەکولەمەرگی بەرگەی ژیانە زەحـمـەتەکە دەگرێت، کار دەکات هەموو کۆششەکان بەردەوام بێت تا منداڵەکانی خوێندن تەواو بکەن، بۆیەش هـەمـوویـان بەئازایەتیی دایکیـان خـوێندنی زانکۆ تەواو دەکەن و دەبنە خاوەن بڕوانامەی زانکۆ.

## لە قوتابخانەکانی ریژیو ئیمیلیادا

رۆمانو پرودی و فلاڤیای هاوسەری سەردانی ئەو قوتابخانەیە دەکەن، چونکە ئەوان لە ریژیوی باکوری ئیتاڵیاوە هاتوون، ماوە ماوەش لەوێ بووینە، ئەوان لەوێ و لە پاش کۆتاییهاتنی جەنگەکە یەکسەر دەچنە پۆلی یەکەمی سەرەتایی لەو قـوتابخـانـەیەدا، بەڵام ژنەکـە لە سـەرەتای پەنجـاکـانی سـەدەی رابردوو چوویتە مەکتەب، واتە ماوەی نێوانیان لە چوونیان بۆ ئەو قوتابخانەیە نزیکەی حەوت ساڵە. قوتابخانەکە دەکەوتە ناو نەواکەیەکی منداڵە بێ دایک و باوکان و بە بەردەوامی پێشـــوازیی لەو منداڵانە کـردووە کـە بووبوونە قـــوربانیی جـەنگەکـە، لەگـەڵ ئەوانە مـنداڵانی گـەڕەکـیـشی تێدا بووە. بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەکە بیداگوجییەکان مەبەستیان بوو تا قوتابخانەکەیان لە دواڕۆژا نەبێتە گیتۆیەک و بەو هۆکارە ئەو منداڵانە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە نامۆ نەبن، ئەوان بڕیار دەدەن بێجگە لەو منداڵە بێ سەرپەرشتارانە منداڵەکانی هەموو

گەرەکەکە وەرگرن. رۆمانو هەرگیز منداڵە هەژارەکانی ئەو قوتابخانەیەی لە بیر نەکردووە، ئەوانەی قۆناخێکی خوێندنیان بەیەکەوە بووە و هەموویان دەناسێتەوە، ئەوەی لە رەشکردنەوەی مۆر و سەتمپەی پۆستا زۆر وریا بوو، پوولەکانی پاک دەکردەوە تا لە جەژنی سەرەساڵدا دووبارە پوولەکان بەکار بهێنەوە.

فلاقیا سەرەتای هاوڕێیەتیی لەگەڵ رۆمانو لە بیر ماوە و دەڵێت:

هەر لە منداڵییەوە سەردەمی نەبوونی و نەهامەتییەکانی پاش جەنگەکەمان دیبوو، ئەو دەمانەی کاتی تێپەڕبوونی قۆناخە ناخۆشەکان بوو، سەرەڕای ئەوەش بیرەوەرییەکان جیاواز بوون، رۆمانو زۆر شەیدای خوێندن نەبوو، سەرەتا حەزی لە یاریی فوتبۆل کردووە و بەردەوام لە ناو گۆڕەپانەکان و لەسەر شەقامەکاندا یاریی کردووە، بەڵام لە قۆناخی ناوەندی ئەو کورە دەگۆڕێت و دەبێتە خوێندکارێکی وریا و گوێڕایەڵ. من قوتابییەکی کۆڵنەدەر بووم، مامۆستاکانم ئامۆژگارییان کردم، بچمە قۆناخی ئامادەیی، لە بیرمە من ئەو دەمانە حەز و ئارەزووی نووسینی ستوونی رۆژنامەگەریم تێدا بوو، زۆریش بەسەردەمە رۆشنگەرییەکان سەرسام بووم.

## هاوڕێیەکانی زانکۆمان گەیشتنە پۆستی حکوومەت

کە رۆمانو و ئەندامانی حکوومەتەکەی لە پێش سەرکۆمار ئۆسکار لویجی سکالفارۆ سوێندی دەستوورییان دەخوارد، ئاگام لێ بوو کەوا وەزیری کار لیزیانۆ بەگوێی رۆمانوی پرودی دەچرپاندو دەیوت: تەواو. ئەو وشەیە لەلای رۆمانو نامۆ نەبوو، ئەو وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ قۆناخی خوێندنی زانکۆ، ئەو وەزیرە لەگەڵ رۆمانو لە کۆلێجی ئوگستینیانومی کاسۆلیک بەیەکەوە بوون ئەوان کە لە وانەی یاسای تایبەت سەردەکەون ئەو وشەیە دەڵێنەوە، چونکە دەرسەکە یەکێک بوو لە وانە زەحمەتەکانی قۆناخی یەکەمی کۆلێجەکەیان. هەر لەو پۆستەش یەکێکی تر لە کۆنە هاوڕێیەکانی زانکۆیان جیوفانی ماریافلیک دەبێتە وەزیر، ئەو سێ کەسە بەیەکەوە لە کۆلێجی ئوگستینیانوم

پاسایان خوێندووە، ئەو مەڵبەندە لەبەرئەوەی لە هەموو دەڤەرەکانی ئیتاڵیا خەڵک رووی تێ دەکرد، کە زۆربەیان لە خێزانە سادەکان بوون بۆیەش بووبووە ئەزموونێکی تایبەت بۆ خوێندکارەکان، هەمووشیان سوودیان لەو برە پارەتییە وەردەگرت کە پێشکێشیان دەکردن، هەر ئەوانەش لە پۆستەکانی کارکردندا دەچوونە پێشەوە تا ئەوەی بووبوونە کەسانی پێشەنگ لە ناو ئیتاڵیا.

ئەو کۆلێجە نەک تەنیا روانگە بووە بۆ خوێندکارەکان، بگرە بووبووە ئەوایەک بۆ گۆڕینەوەی هزرەکان و تەکوین و ئەوەش ئەزموونەکەی زانکۆی دەوڵەمەند کردبوو، قەشەکان ئامادەییەکانیان ساز کردووە و ئەوان بووبوونە سەرچاوەی خوێندکارەکان، چونکە ئەوان بەردەوام لەگەڵ خوێندکارەکان زۆر دەمانەوەو بۆ ماوەیەکی درێژ هاوشانیان دەبوون.

فلاڤیا لە ساڵی ١٩٦٦ دەچێتە کۆلێجی زانستە سیاسییەکان لە پۆلۆنیای ئیتاڵیا، کۆلێجەکە یەکێک بووە لە مەڵبەندە نوێیەکانی خوێندن کە بۆ گەشەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ئیتاڵیا دەکرێتەوە. ئەو ژنە قۆناخەکانی خوێندنی ئەو کۆلێژەی باش لە بیرە و دەڵێت ئەودەمانە خوێندن لەو زانکۆیە تەژی بووە لە شڵەژان و نائارامی، بۆیەش ئەنجوومەنی زانکۆ بەناچاری بڕیاری بەڕێکردنی ئەو ساڵە دەدات، سەرەتا نارەزاییەکان لەسەر شێوازی دەرس وتنەوەکان بووە، بەڵام پاشان نارەزاییەکان دەگاتە سەر سروشتی بەرنامە و پرۆگرامەکان. فلاڤیا دەڵێت:

نارەزاییەکان ئاراستەی تر بەخۆیەوە دەبینێت، لە قەوارەی گلەیی و نارەزایی لەسەر بەرنامە و وانە وتنەوەکان تێ دەپەڕێت تا دەگاتە رەوشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان، سەرەتا نارەزاییەکان لەسەر هەموو سیستەمەکان بوو.

## بەشداربوون لە كۆڕی خەبات

زۆربەی سەركردایەتیی سیاسیی ئیتاڵی لە كۆلێژی ئوگستینیانوم دەرچوون، بۆیەش رۆمانو نووسیویەتی:

هەموو هاوڕێیەكانی ئەوەی ئێمە كە خوێندنیان لەو كۆلێژەدا تەواو دەكەن كاری سیاسییان هەڵدەبژارد، چونكە سیاسەت لەوەدەمانە وەك نانی رۆژانە وابوو، یان دەكرێ بڵێین لە نانەكەش زۆرتر بوو، فاكتەری ئەوەش بەڕوونی دیار بوو، چونكە سیستەمی وانەكانمان و بەرنامەكان هەموو بوارساز بوون تا هەموومان قسە لەسەر سیاسەت بكەین، بەڵام كاركردن لە سیاسەتدا دوا دەخست بۆ سەردەم و كاتێكی گونجاوتر، واتە پاش ماوەی فێربوونە زانستییەكان، ئێمە وا فێر بووین كەوا سیاسەت چالاكییەكی شەریفانەیە و پێویستمان بە بەهێزكردنی بنچینە بنەڕەتییەكان بوو بۆ ئێمەی گەنجە گچكەكان. رۆمانو لەسەر قسەكانی بەردەوامە و دەبێژێت:

من لە تەمەنی سی ساڵیدا دەستم داوەتە كاری سیاسی، ئەوەش پاش ئەوە بووە كە خوێندنم لە زانكۆ تەواو كردووە، بەڵام پێش ئەوەی بێمە ناو مەیدانی پۆلیتیك زۆر بیرم كردووەتەوە، ئەو خاڵ و وەرچەرخانەم باش هەڵسەنگاندووە، بەتایبەتی كە ژیانی خۆم لەگەڵ خەڵكە ئیتاڵییەكان و بێگانەكان بەراورد كردووە، لە زۆربەی وڵاتاندا سیاسەتكردن لەسەر خەڵكەكە فەرز كراوە، ئەوەش پێویستی بەوە نەبووە تۆ كار و پیشەیەكی تایبەتیت هەبوویێت. ئەوە دەگێڕمەوە كەوا جارێكیان لەگەڵ وەزیری یەكەمی ژاپۆنی قسەمان دەكرد كە زانی من یەكەم وتارم لەو ئەنجوومەنە پێشكێش كردووە كە بوومەتە سەرۆكی ئەنجوومەنەكە، بەوە زۆر سەرسام بوو، ئەگەرچی ئەو وتی ئەوەی لەلای ئێمە ئەوانەی دەگاتە ئەو پۆستە چەندین كۆسپ و ئیعتباراتی توندكار دەبڕن، ئەو سێزدە ساڵ ئەندام پەرلەمان بووە تا نۆرەی ئەوەی هاتووە لە پەرلەمان وتاری رەسمی پێشكێش بكات. ئەگەرچی من لە یەكەم كۆبوونەوە بوومەتە سەرۆك و وتاری فەرمیم پێشكێش كردووە. ئەوەش لە وڵاتانی ئەورووپی دیسپلینێكی

توندکار بووە، منیش لەگەڵ ئەو نموونەیەدا زۆر بەوەفا دەمێنێمەوە کە لە زانکۆوە وەرم گرتووە بەتایبەتی ئەو بوارانەی پێوەستن بە ئیتاڵیا، دڵنیاشم کەوا نموونەی جیاوازیی تریش لە سازکردن و گەیاندنیان هەیە و ئەوانیش زۆرتر کاریگەرن.

## بژارە پیشەییەکان و بەرژەوەندییە هاوبەشەکان

رۆمانو کە خوێندنی یاسا تەواو دەکات دەست دەکات بە خوێندنی ئابووری و لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتیی پرۆفیسۆر سیرو لومباردینییەوە تێزە ئابوورییەکەی لە ماوەی پاش جەنگی جیهانی وەردەگرێت، ئەو دەبێتە یەکێک لەو کەسە نوێخوازانەی کۆشش دەکات زانستە ئابوورییەکانی لە پاش کۆتاییهاتنی جەنگەکە گەشە بکات، یەکێکیش دەبێت لەوانەی بەوردی چاودێریی ژیانی سیاسی لە ئیتاڵیا دەکات، زۆر بەوردیش توێژینەوە لەسەر قوتابخانە ئابوورییەکەی لەندەنی دەکات، بەڵام فلاڤیای هاوسەری روو لە خوێندنی سیاسەت دەکات.

رۆمانو ژیانی پیشەیی خۆی وەک مامۆستایەکی یاریدەر لە زانکۆی پۆلۆنیا دەست پێ دەکات، تا دەگاتە پۆستی مامۆستای ئابووریی پیشەسازی لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان، کە لە بەرنامەکانی تێستگەیی ئامادە دەبێت و باس لە تەنگژە ئابوورییەکان دەکات، یان کە باس لە سیستەمە بانکییە ئابوورییەکانی ئیتاڵیا دەکات بەتایبەتی لەسەر هۆکارەکانی هەڵاوسان کە گەیشتبووە رێژەی ٢٠٪ لە ئیتاڵیا، لەودەمەوە کەسایەتیی رۆمانو دەناسرێت و دەبێتە کەسێکی دیار و شارەزا لەو بوارە ئابوورییە هەستیارەیدا.

فلاڤیا بەرنامەیەکی تێستگەییی هەبوو، ئەو لە بەرنامەکەی (کاغەزەکانی سەر مێزەکە) لە کەناڵی سێیەمدا لەگەڵ مامۆستاکاندا داوەتی رۆمانوی کردووە، ئەو ژنە ئەو کاتانە بەو شێوەیە دەگێڕێتەوە:

لە ترسی پرسیار و گلەییەکانی خەڵکەکە بەرنامەکانمان بەسادەیی و سووک تۆمار دەکرد، من زۆرجار یارمەتیی دەرهێنەرەکەم دەکرد و لە نێوان

بڕگەکانی بەرنامەکەدا تراکی موزیکم دادەنا، بە مەرجێک موزیکەکان لەگەڵ ناوەڕۆکی بەرنامەکان و دیالۆگەکان بگونجێت، زۆریش کارمان دەکرد پێوەندییەکە لەگەڵ بابەتەکان پتەو بێت، لە بیرمە جارێکیان گۆرانیی کاروزونی (کاروانی پترۆڵ)م لەگەڵ بڕگەیەکی بەرنامەکە دانابوو کە باس لە تەنگژەکانی پترۆڵ و بەرزبوونەوەی نرخی پترۆڵمان تێدا دەکرد. لەو کاتانەدا ڕۆمانو وانەبێژی بابەتی ئابووری بوو بۆ قەشەکان لە زانکۆی پۆلۆنیا، ئەوەی لە بیریان ماوە ئەوا ڕۆمانو لەگەڵ خوێندکارەکاندا زانستی لاهوت بەیەکەوە کۆی دەکردنەوە، ئەوان دەیانویست تێ بگەن چۆن پارە و سامانی گشتی سەرف بکرێت، لەو دەمانەوە بایەخ و کارنامەی ئەو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی گشتیی ئیتالی و میللەتەکە ئاوێتە دەبێت، زۆرتر ڕوو لەو بوارەدا دەکات.

## لە کڵێسادا

ڕۆمانو زۆر سەردانی کڵێسای بروسیری لە شاری ڕیژیو ئیمیلیا کردووە، بەڵام فلاڤیا سەردانی کڵێسای قەدیس پییری کردووە، زۆریش لەو کڵێسایەدا دیمانەیان بووە، ئەوەش پاش ئەوە بووە کە ماڵەومیان لە گەڕەکەکەیان دەگوازنەوە گەڕەکەکەی ماڵی فلاڤیا. ئەو دوو کڵێسایە دەکەوێتە سەنتەری شارەکە، کڵێساکان بۆ هەوادارەکانیان شوێنی سپۆرتیان ساز کردبوو، لەوێ مەشقەکانی سپۆرتیان تێدا ئەنجام داوە، هەر لەو دوو کڵێسایەدا شوێنی دیالۆگ و دیمانەشی تێدا بووە، وەک چۆن ئەو ژنە دەگێڕێتەوە، کەوا (تەکوین)ەکە بوو ئەوانی ساز کردبوو تا بەرنامەڕێژی بکەن بۆ پشتیوانی لە چالاکیی کاسۆلیک لە ئیتالیادا.

فلاڤیا و ڕۆمانو لەو دوو کڵێسایەدا پلەکانیان بەرز دەبێتەوە و زۆریش بە بنچینەکانی کاسۆلیک تێر دەکرێن و زۆر شارەزاتر دەبن، دەتوانن وەڵامی کورت و ئامادە بۆ پرسیارە ئاینییەکان ساز بکەن، بۆیەش هەردوو کوڕەکەیان لەو کڵێسایەدا جێگیر دەکەن، تا ئەوانیش بەو ڕەوت و جۆگە ئاینییە تێر بن، هەر لەوێش کوڕەکان دوو کیژ لە کڵێسا دەدۆزنەوە و لەوێش مارەیان دەکەن.

## باندۆری کڵێسا لەسەر رۆمانو و فلاڤیا

جیاوازیی تەمەن لە نێوان رۆمانو و فلاڤیا حەوت ساڵی تەواو بوو، ئەوەی لە بیر فلاڤیا ماوە کەوا شوێنی تەکوینی ئاینیی ئەوان تەنیا کڵێسا نەبووە، بگرە ئەوان بەشێک لە زانیارییەکانیان لەو خەڵکەوە بووە کەوا هاموشۆیان کردوون، تا کۆتاییی پەنجاکانیش خەڵکی هەرێمەکانی ئیتاڵیا زۆربەی کاتیان لە کڵێسادا بەسەر بردووە، کە بووبووە سەرچاوەی ئاینیی هەموو خەڵکی گەڕەکەکان، لە شارەکانی ئیتاڵیادا هۆڵی جمباز و ناوەندی فێربوونی زمانی تێدا نەبوو، مەلەوانگەیان نەبووە و تەلەڤزیۆنیان نەبووە، بۆیەش زۆر لە گەنجەکان کاتەکانیان لە بارەکانی مەشروب خواردنەوە بەسەر بردووە.

کڵێسا تاکە سەرچاوە و مەڵبەندی خەڵکەکە بووە، کە بووبووە مەڵبەندی لایەنە ئاینی و ئینتیمای سیاسی و کۆمەلایەتی هەتا پێوەندییەکانی خێزانەکانیش، هەروەها کڵێسا وەسیلەیەک بووە بۆ تەکوین، هەموو خەڵکەکە و لەسەر هەموو ئاستەکان روویان لە کڵێساکان کردووە، لەوێ چالاکیی سپۆرتی تێدا کراوە و کاتیان بۆ خۆشی تێدا بەسەر بردووە، هەموو بارەکانی تەکوین و ئاینییەکان لەو مەڵبەندە ئاینییە بووە، بۆیەش کەنیسە بووبووە نموونەیەکی فێرکردنی نەرم و کراوە بەڕووی جیهانییەوە.

## پاش حەڤدە ساڵ لەسەر کاری سیاسی
## دەبێتە راوێژکاری کاروباری شارەوانی

فلاڤیا دەڵێت بواری کارەکەی من پارمەتیی رۆمانۆی داوە، تا ئەو زۆر لە کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی رۆژانەی ناو وڵاتەکەمان شارەزا بێت من هاوکاری دەبووم.

ئەو سێ ساڵ وەک مامۆستایەک لە بواری دەزگاکانی کۆمەڵایەتی لە شارەکانی ئیتاڵیا کاری کردووە. لەسەر ئەو ئەزموونە ژنەکە نووسیویەتی:

من لە ساڵی ١٩٧٤ لە ئامۆژگەی ئیمیلی رومانی تایبەت بە خزمەتگوزاریی تەندروستی و کۆمەڵایەتی کارم کردووە، ئەو فێرگەیە سیمایەکی کاسۆلیکی پێوە بوو، وەک زۆربەی زۆری دەزگا پیشەییەکانی تایبەت بە کاروبارەکانی تەندروستی، لێرە ئەوەش دەڵێم لەو دەمانەی کە لە ناو قوتابخانە و زانکۆکاندا ئاژاوە و ئاشووبە پەیدا بوو ئەو ئامۆژگایەش لە ساڵی ١٩٨٦ دادەخرێت. کە یاسای باساقلیا لە ساڵی ١٩٧٨ پەیرەو دەکرێت بوارەکانی خزمەتگوزارییەکان گۆڕانی زۆریان بەسەردا دێت، کە بەپێی ئەو یاسایە هەموو نەخۆشخانە دەروونییەکان دادەخرێن و لە جیاتی ئەوانە مەڵبەندی تەندروستیی ئاوەزی دەکرێتەوە و یەکەمین جاریش بایەخ بە دیاردەی لادانی کۆمەڵایەتی دەدەن.

## لە ناو دڵی سیاسەتدا

لە پاش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا بنەماڵەی پرودی لە ناوچەی سکاندیانوی نزیک ریژیو ئیمیلیا بار دەکەن، ئەو ناوچەیەی پرودی تێیدا لەدایک بووە، بەڵام دووبارە دەگەڕێنەوە ئەو خانووەی لە سییەکانەوە تێدا

ژیاون، بەڵام ئەوجارە خانووەکە لە حزبی شیوعی بەکرێ دەگرنەوە چونکە ئەوان خانووەکەیان کرێ بوو. خانووەکە دوو دەروازەی تێدابوو، یەکێکیان دەگەیشتەوە ناو بارەگەی حزبی شیوعیی ئیتالی، کە تێدا کۆنترین سەرکردە و دامەزرێنەری حزبەکە (ئەنتونیۆ قرامسی) کۆبوونەوەکانی تێدا دەکرد، لە بەشێکی تری ئەو باڵەخانەیەدا چەند خێزانێک بەکرێ تێدا دەژیان.

پرودی ئەوەی باش لە بیرە کە لە ماڵەکەی خۆیانەوە و لە پەنجەرەکەی ئەوانەوە بینیویەتی کە شیوعییەکان پرۆڤەی یادی مردنی ستالینیان کردووە، ئەوەشی لە بیر ماوە کەوا یەکێک لە هاوڕێیەکانی ئەو حزبە سەبارەت بە ستالین وتوویەتی:

ستالین نەمردووە، ئەو لەبەر خاتری ئەوەکانی ئێمە دەژیت، بۆیە ئەو ئێستا نەمردووە.

پرودی دەڵێت، من دەمبینی کەوا چۆن ماڵەوەمان مانگانە کرێی خانووەکەیان دەدایە بەرپرسی دارایی حزب، کە ناوی (رینو سیری) بوو، لەو دەمانەوە پرودی پێوەندی بەو پارەوەرگرەکە و بە ئەندامانی تری ناو ئەو حزبەوە دەکات و ژمارەیەکی زۆریان دەناسێت، بۆیەش ئەو لە تەمەنێکی گچکەییەوە دەبێتە راوێژکاری کاروباری شارەوانی.

ئەو پۆستەی کە پرودی هەیبوو، دەبێتە روانگەی هەموو کێشە و گرفتی خەڵکی ناوچەکە، چونکە ئەودەمانە کێشە کۆمەڵایەتییەکان لە ناو ئیتاڵیا زۆر بوو، بۆیەش خەڵکەکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان روویان لە ئەنجوومەنی شارەوانی دەکرد، ئەوەش بەشێک بوو لەو ململانێیە سیاسییەی کە لەسەر گۆڕەپانی ئیتالی و دەولی رەنگدانەوەی هەبوو. لەو رۆژانەدا لە مێژووی ئیتاڵیا دانوستاندن و قسەکردن لە ناو ئەنجوومەنەکانی شارەوانی لەسەر سیاسەتی دەولی و شەرعیەتی پەیمانی ئەتڵەسی گەرم بوو، لە ساڵەکانی گەرمەی شەڕی ڤێتنام سیستەمی سیاسیی وڵاتەکە گەشەی پێوە دیار بوو، تا ئەو ساڵانەی کە تێدا رینو سیری دامەزرێنەری حزبی شیوعیی ئیتالی دەبێتە سکرتێری ناوەندی پێوەندییەکانی دەرەوەی بۆ پێوەندییەکانی دەولی لەگەڵ حکوومەتی

هەڤاڵبەندی بە سەرۆکایەتیی رۆمانو پرودی.

لە یەکەمین ئەزموونی سیاسی رۆمانو پرودی کە دەبێتە راوێژکار لە کاروباری شارەوانی و لە هەڵبژاردنەکەدا دەردەچێت کاردانەوەی لەسەر خێزانەکەی ئەودا دەبێت، چونکە لەوەتی بۆ خوێندن روو لە زانکۆی میلانۆ لە لەندەن کردووە لە ماڵەوە دوور دەکەوێتەوە.

شاری ریژیو لەسەر رۆمانو تازە نەبوو، ئەویش لەو شارە نامۆ نەبوو چونکە بێجگە لە خۆی نۆ کەس لە خوشک و براکانی لە ماوەی بیست ساڵدا لە قوتابخانەکاندا رۆڵیان هەبووە و توانیبوویان تۆڕێک پێوەندی لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا بگرن، هەمووشیان پێوەندیی گەرمیان بە جیهانی کاسۆلیکەوە هەبووە. سەرۆک حکوومەتی ئیتاڵیا ماوەیەکی کورت لە پۆستی راوێژکاری شارەوانی دەمێنێتەوە و کە کارێک لە زانکۆ وەردەگرێت لەو پۆستە دەست لەکار دەکێشێتەوە، هەر ئەو رۆژەی واز دەهێنێت تا سەعات سێی بەیانی پێوەندییەکەی دەمێنێت و لە سەعات حەوتی بەیانی سواری شەمەندەفەر دەبێت و بەرەو شاری پۆلۆنیای ئیتاڵی بەرێ دەکەوێت، کە تێدا کاری وانەبێژیی وەرگرتووە.

## پابەندبوونی کولتووری بە ریژیو ئیمليا و دەوروبەرەکەیدا

ئەگەرچی شاری ریژیو ئیمليا شارێکی گچکە بووە، بەڵام لە بوارەکانی سیاسی و کولتووری و هونەریدا لە ساڵی شێستەکانی سەدەی رابردوودا گەشەی زۆری تێدا بوو، بەڵام ئەو ژن و مێردە ئەگەرچی لەوێ ژیاون و لەوێش خوێندوویانە و هەر لەو شارەش پرۆسەی هاوسەرگیرییان کردووە، بەڵام ئەوان رۆڵیان لەو شارەدا نەدیوە و لە رووداوەکانی ئەوێندەرێ ئەکتیڤ نەبوون. فلاڤیا دەبێژێت:

ئێمە لەگەڵ رۆمانو لە زۆر لە چالاکییە کولتوورییەکانی ئەو شارە بەشدار دەبووین، زۆریش دەچووینەوە ئەو شارە و هاوکار دەبووین لەو بەرنامانەی مۆرکی ئاینیی کاسۆلیکیان هەبووە، دەڵێ لە رێگەوە بووین بەرەو ئەو شارە لە

ڕێگەدا ئۆتۆمۆبێلە مارکە فیاتە ٨٥٠ کەمان شکاو لە نیوەی ڕێگەدا ماینەوە، ئێمەش زۆر تەنگاو بووین چونکە (قەشەی باوک ماری دومینیک شنو)مان لەگەڵدا بوو، دەبووایە ئەو لە کاتی دیاریکراودا بگاتە ئەوێندەرێ کە تێدا کۆڕێکی هەبوو، کە شوفێرێک بۆمان دەوەستێت من و باوکە قەشەکە دەگەیەنێتە شارەکە و لە کێشەکە ڕزگارمان دەکات.

## لە پۆلۆنیا و پێش سیاسەت

کە ڕۆمانو و فلاڤیا پرۆسەی هاوسەرگیری لە ساڵی ١٩٦٩ دەکەن بەیەکجاری شاری ڕیژیو ئیملیا جێ دەهێڵن و لە شاری پۆلۆنیا نیشتەجێ دەبن، لەوێ و لەو شارەدا شێوازە کۆمەڵایەتییەکەی ڕابردوویان دەگۆڕێت، بەڵام دەکەونە ناو ژیانێکی تری کولتوورییەوە، لەوێ بەردەوام لە کۆنگرەکان، لە کۆڕەکاندا بەشدارییان دەبێت، لەگەڵ ڕۆشنفکرەکانی شارەکەدا دیالۆگ دەکەن، لە سەنتەرە کولتوورییەکان ئامادەییان دەبێت، بەتایبەتی دەزگای مولینۆی کولتووری ئەوەی بە زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەگاتە ئیتاڵیا و دەزگایەکی بەخش دادەمەزرێنن و دەقە ئەنگلۆسکسۆنییەکان وەردەگێڕنە سەر زمانی ئیتاڵی. ئەو دەزگایە باندۆری لەسەر خوێندنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستە سیاسییەکان لەسەر ژیانی سیاسیی ئیتاڵی دەبێت، کە ڕەوشێکی نوێخوازی پەیدا دەکەن و ئەوەش پاش گۆڕانەکان لە سیستەمە ئابووریی ئیتاڵی سەر هەڵدەدات. دەزگای مۆلینو زەمینەیەکی بەپێت ساز دەکات بۆ سازبوونی کۆمەڵەی دیالۆگی سیاسی لە ئیتاڵیا، ئەو دیالۆگەی لە نێوان کولتووری لیبرالییەکان کولتووری کاسۆلیکە دیموکراسەکاندا ڕووبەڕوو دەبنەوە.

## وەزیر لە حکوومەتەکەی ئەندریوتی

سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵی (جولیو ئەندریوتی) داوای زانیاری و ئەزموونی تایبەتی ڕۆمانو پرودی کردبوو، پاش ئەوەی زانیارییەکانی بە دەست دەگات

لەگەڵ بوندولفی وەزیری خەزانەی ئیتاڵی سەیری ڕاپۆرتی زانیارییەکانی دەکات، لەو دەمانەش حزبی دیموکراسی کریستیان کۆنگرەی دەبێت، بۆیەش لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٨دا بڕیار دەدەن ئەو لە بواری تەکنیکدا دامەزرێنن، لەو بوارەدا چەندین پۆست وەردەگرێت، لەوانە وەزیری پیشەسازی ئەو دەکاتە جێگری سکرتێر. کە سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵی سەرقاڵی ئەوە بوو ئەندامانی حکومەتەکەی فرەڕەنگ بکات، داوا لە وەزیری خەزانە فیلیبو بوندولفی دەکات ناوی پسپۆڕێکی لێزانی ئابووری پێشکێش بکات تا بتوانێت وەزارەتی پیشەسازیی بۆ بەڕێوە ببات، ئەویش لە وەڵامی داواکەی سەرۆکدا ناوی ڕۆمانوی دەداتێ، سەرۆکیش زووتر ئەو ناوەی پێ گەیشتبوو تا لە بەردەم ئەندامانی کۆنگرەی حزبی دیموکراسی کریستیان پێشنیازی بکات، ئیتر بەو جۆرە کە ڕۆمانو لە دەرەوەش پشتیوانیی چەپەکانیش بەدەست دەهێنێت دەبێتە ئەندامێکی حکومەتەکە.

فلاڤیا تەمەنی سی و یەک ساڵ بوو کە هەواڵی ئەوەی دەدەنێ کەوا هاوسەرەکەی بوویتە وەزیر، کە هەرگیز چاوەڕوانی ئەو هەواڵەی نەکردووە، بەوەش هەموو شێوازی ژیانی دەگۆڕێت، ئەگەرچی ڕۆمانو کارەکەی بەزەحمەت دەزانێت بەڵام قەناعەتیشی هەبوو کەوا شرۆڤەکردن و ڕەخنەگرتن لە مەسەلەکان لەگەڵ بڕیاردان جیاوازیی هەیە، زانین و تێگەیشتن لە کێشەکان مەرجێکی پێویست نییە لەسەر وەرگرتنی وەزیفەی حکومەت لە هەموو پۆستەکان. لەو دەمانە ئیتاڵیا زۆر سەرقاڵی دامەزراندنەوەی دەزگاکانیان بوون، کە تەژی بوون لە کێشە و ئاڵۆزییەکان، ڕەوشەکەش ئەوەی دەخوازی کەوا شرۆڤەیەکی زۆری دەویست لە بوارەکانی کەرتی پیشەسازی و ئابووری.

فلاڤیا بوویتە هاوسەری وەزیری پیشەسازیی ئیتاڵی، ئەوەی لە بیرە کە ڕۆژێکیان لەگەڵ ڕۆمانوی وەزیر بەرەو ڕاڤان دەچوون لەسەر ڕێگەی خۆیاندا لە سەردانێکی لە ناکاودا سەردانی یەکەیەکی بەرهەمهێنانی بۆری دەکەن، لەوێ بۆیان دەردەکەوێت کەوا یەکەکە لەلایەن کرێکارانەوە ئیفلیج بووە. کە

کرێکارەکان دەزانن میوانەکەیان وەزیرەکەی ئەوانە دەست بەگلەیی دەکەن، قسە لەسەر ئەوە دەکەن کەوا دەزگاکەیان سستە و بەرهەمی نییە، ئەگەرچی دەزگاکەیان یەکێکە لە کارگە گەورەکانی ئەوروپا. فلاڤیا وتوویەتی کەوا قۆناخەکە ئەستەم و تراجیدی بوو، چونکە لەو دەمانەدا دەزگا ئیتاڵییەکان یەک لە دوای یەکدا دەڕووخان، ئەگەرچی رۆمانو پێش ئەوەی ببێتە وەزیر ئەو لەسەر یاسایەک بۆ پشتیوانیی دەزگاکان و کۆمەککردنیان ئیمزای کردووە تا ئیفلاس نەکەن.

## لەو ئاهەنگەی لەسەر شەرەفی شاژنی هۆڵەندا ساز کرابوو

باوکی فلاڤیا لە تەمەنی پەنجا و نۆساڵیدا کۆچی دوایی دەکات، بۆیە کۆستەکەی گەورە بوو بۆ ئەو ژنە، چونکە ئەو بیرەوەرییە جوانەکانی ئەوی زۆر لە بیرە، وەک ئەو ئاهەنگەی کە لەسەر شەرەفی شاژنی هۆڵەندا (پیاتریس) ساز کرابوو، باوکی داوای لێ دەکات بۆ ئەو بۆنەیە فستانێکی دەرچوونی نایاب و ناوازەی درێژ بکڕێت، هەروەها باوکەکە بە کیژەکەی دەڵێت دەبێ هاوسەرە وەزیرەکەت بەدلەی جۆری سمۆکن لەبەر بکات، چونکە پرۆتۆکۆلەکان و ئامادەبوون لەو بۆنەیەدا ئەوە دەخوازێت.

لەبەر وەزیفەکانی دەبووایە رۆمانو بچێتە رۆمای پایەتەخت و ماڵەکەی لە پۆلۆنیا بگوازێتەوە، بەڵام کە حکوومەتی نوێ پێک دەهێنرێت پەلە لە رۆمانو دەکرێت بەزووترین کات بگوازێتەوە رۆما، ئەگەرچی ئەو تەنیا پێنج مانگ بوو ئەرکە نوێیەکەی لە جیهازی راپەڕاندن وەرگرتبوو، کە حکوومەت رادەگەیەندرێت ئەو لە بەردەم لیژنەیەکی پەرلەمانیدا سەرقاڵی سازکردن و شرۆڤەکردنی یاساکەی دەبێت، هێشتا کارەکانی دەمێنێت کە داوای لێ دەکەن بگاتە وەزارەتەکەی، کە دەگاتە ئەوێندەرێ دەبینی دوو لە یاریدەرەکانی هەموو کتێب و دۆسیە تایبەتییەکانی بۆ کۆ کراوەتەوە، دوو سەعات پاش ئەوەی لە پۆلۆنیاوە دەگاتە رۆما دەبینێت هەموو کەرەستە و پێداویستییەکانی بەخێرایی بۆ فەراهەم کراوە.

## پاش حەڤدە ساڵ لە دوورکەوتن دووبارە دەگەڕێتەوە

پاش حەڤدە ساڵ رۆمانو پۆستێکی سیاسی وەردەگرێت، وەرگرتنی ئەو پۆستە بۆ یەکەم جار لە ناکاو بوو، وەرگرتنی پۆستەکە و شێوەی کۆتاییهاتنەکەی چاوەڕواننەکراو بوو، ئەوەی شیاوی ئاماژە پێکردنە کەوا بەشداری و دەرچوون و وازهێنانی پۆستە سیاسییەکانی لەو دەمانە لە ئیتاڵیا بەپێچەوانەی ئەو رۆژگارەیە. ئەو لە ژیانی وەزیفەدا کار و بەرنامەکانی پێوەندیی پتەوی بە سیاسەتەوە هەبووە، ئەو دەمانەی لە زانکۆ بووە لەگەڵ رۆژنامەکاندا هاوکار بووە، لەوانە لاڤونیرو ئەلسول ٢٤ ئەوەرو کوریز دیلا سیرا، لەوانە بەردەوام وتاری ئابووریی تێدا دەنووسی، بۆچوونە سیاسییەکانی نیشان دەدا.

رۆمانو پرودی دەبێتە سەرۆکی ئامۆژگەی بنیاتنانەوەی پیشەسازی، دووجاریش ئەزموونی سەرۆکایەتیی دەزگای جیبی کە دەزگایەکی دارایی گشتییە دەکات، کە کاری ژماردنی دەزگاکانی کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی کێشە و گرفتیان هەبووە تا دووبارە نۆژەنیان بکاتەوە، دووەم جاریش دەبێتە سەرۆکی دەزگای ماسیراتی تایبەت بە دروستکردنی ئۆتۆمۆبێل لە شاری مودین. سیاسەت لە ئیتاڵیا رۆڵی کاریگەری هەبوو بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی کەسانی کارامە و لێزان، رۆمانو کە دەبێتە سەرۆکی ئامۆژگەی بنیاتنانەوەی پیشەسازی، کار دەکات هۆکارەکان و جۆری تەنگژەکان لە دەزگا گشتییەکان هەڵبژێرێت و شرۆڤەیان بکات، کار دەکات توێژینەوەی بکات بۆ سازکردنی شێوازی بەرنامەی پسپۆڕییەکان بۆ ئەو کارگانە، ئامۆژگەکە کارکەر دەبن لە ساڵانی نێوان ١٩٨٢ تا ١٩٨٩و بۆ جاری دووەمیش لە ساڵانی ١٩٩٣ تا ١٩٩٤ واتە راستەوخۆ یان پاش دەستبەکاربوونی حکوومەتەکەی برلۆسکۆنی بووە.

لە قۆناخی دووەمی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتیی وەزیران لەلایەن کارلۆ ئازیقلیو کیامبییەوە زۆر رەوشتی ناشەریفانە پەیڕەو کراوە، بەتایبەتی لەسەر

ئاستی ئیدارەی بەڕێوەبردنی دەزگا گشتییەکان، بۆیەش داوا لە رۆمانو پرودی کرابوو بەهانای ئەو دەزگایانەوە بێت و چاکسازییان تێدا بکات.

فلاڤیا دەڵێت سەرۆک وەزیران داوا لە رۆمانو دەکات بەپەلە وەڵامی بداتەوە، ئەویش لەسەر پایسکیل بوو بەسەر هەورازێک دەکەوت، بۆیەش ژنەکە ناتوانی وەڵامی سەرۆک وەزیران بداتەوە، چونکە پیاوەکەی دوو سەعات بوو بۆ پیاسەکردن لە دەرەوە بوو، دیارە ئەو دەمانەش تەلەفۆنی مۆبایل نەبوو تا پێوەندیی پێوە بکات.

رۆمانو پرودی ئەوەی کردبووە خوویێکی تایبەتی خۆی ئەگەر لەسەر بڕیاردانی مەسەلەیەکی گرینگ بووایە، پیاسەیەکی دەکرد، یان سواری پایسکیل دەبوو، ئینجا دەگەڕایەوە و بڕیارەکەی دەدا، ئەوەش یەکێک لە رەفتارە نەگۆڕەکانی ئەو بووە و ژنەکەش هێدی هێدی باش شارەزای ئەو رەوشتانەی ئەو بووبوو. فلاڤیا دەقی ئاخاوتنەکەی رۆمانو و سەرۆک وەزیران کیامبیی لە بیرە، ئەویش لەودەمانە نیگەران بوو، دەیزانی هاوسەرەکەی دووبارە دەگەڕێتەوە ناو کێشمەکێشەکانی کە لە ئاکامی کارکردنەکەدا تووشیان دەبێت، چونکە بەشێک لەو خەڵکەی ئەو کاری لەسەر بەرژەوەندییەکانی دەکرد زیانیان لێ دەکەوت، ئەوەش دەبووە سەرئێشە بۆ ماڵەوەیان.

ئەو بڕیارەش کاریگەریی لەسەر سیستەمی بانکە ئیتاڵییەکان دەبوو، هەروەها بڕیاردان لەسەر فرۆشتنی هەردوو دەزگای کریسو و ئەلفا رۆمیو، دیارە فلاڤیا حەقی بووە کەوا ئەو بڕیارە تەنیا لەلایەن کەسە پێوەندارەکانەوە رەخنەی ئاراستە ناکرێت و بەس، بگرە ئەو رەخنە و کاردانەوەیە لەلایەن سیاسییەکانەوە وەک چەکێک دژایەتییان پێ دەکەن.

هەڤاڵبەندیی ڕاستڕۆکان لە پێناوی ئازادیدا لە ساڵی ١٩٩٤ هەڵبژاردنەکانی ئیتاڵیا دەبەنەوە، ئەو پێشهاتەش لە گۆڕەپانی سیاسیدا هەرگیز حیسابی بۆ نەکرابوو، بەڵام فلاڤیای هاوسەری رۆمانو لەلای یەکێک لە یاریدەرەکانی خۆیدا وتبووی کەوا برلوسکۆنی زۆرینەی دەنگەکان دەبات، ئەوەش لە ئاکامی ئەوەدایە چونکە وڵاتەکەمان زۆر ماندووە و هەراسان بووە و گۆڕینی دەوێت، ئەو گۆڕانەش برلوسکۆنی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەدا بانگەشەی بۆ دەکات.

لەو پێشهاتە نوێیەدا رۆمانو یەکسەر خۆی نەهاوێشتە ناو بەرەی ئۆپۆزسیۆنەوە، کەمێک چاوەڕوان بوو تا بزانێت برلوسکۆنی چ دەکات، بەرنامەکانی چۆن جێبەجێ دەکات، بەڵام بنیامین ئەندریاتای سیاسەتمەدار و مامۆستای ناوداری بواری ئابووری و هاوڕێی زۆر نزیکی رۆمانو لەگەڵ دەستەیەک لە هاوڕێیە لێزانەکانی کۆبوونەوەی دەکرد و باسی رەوشی سیاسیی وڵاتی دەکرد و شرۆڤەی پێشهاتەکانی لە بوارەکانی سیاسی و ئابووری دەکرد.

لەو قۆناخەدا قسە لەسەر ئەوە دەکرا بزاڤێکی ئۆپۆزسیۆنی راستەقینە لە ئیتاڵیا ساز بکرێت، بۆ ئەو مەبەستەش رێکخستنە سیاسییەکان، سەنتەرە کولتوورییەکان، نوێنەری ئیشتراکییەکان، نوێنەری حزبی کەسک، لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵگەی مەدەنیی ئیتاڵی و دەزگاکانی پیشەسازی و پیشەوەرەکان و بەرپرسانی سەندیکاکان و لێزانەکانی بوارەکانی زانکۆ و بەرنامەکانی خوێندنگەکان قسەیان لەسەر ئەو رەوشە دەکرد.

فلاڤیا دەگێڕێتەوە کەوا میشاک سالڤاتیکای سیاسەتمەداری ناوداری ئیتاڵی جارێکیان لە کۆبوونەوەیەک کە مۆرکێکی سیاسیی پێوە بوو بە رۆمانۆی وتبوو:

لە ناخەوە خاڵە هاوبەشە حەساسییەکان دەگەنەوە یەک، ئەوەش هاوکێشەیەک لە نێوان هەڵوێستەکان دروست دەکات. بۆیەش ئەو قسەیە دەگێڕمەوە ئەگەرچی تایبەتییە بەڵام من خوێندنەوەی تایبەتیشی بۆ دەکەم.

ئەو جۆرە کۆبوونەوە و دیمانەیە لە هەفتە و مانگەکانی پاشتر بەردەوام دەبوو، بۆیەش فلاڤیا ئاماژەی بەوە داوە کەوا رۆمانو زۆر لەگەڵ قەشە باوک جیوساب لە ئولیڤیتا و لە چەندین دەزگای ئاینیی نزیک شاری پۆلۆنیای ئیتالی کە تێدا (قەشەی باوک دۆسیتی) دوارۆژەکانی ژیانی تێدا بەسەر دەبرد دیداریان دەبوو.

## سەرەتاکانی پەیدابوونی ئۆپۆزسیۆن بۆ سیستەمە سیاسییەکە

لە یەکەم دیمانەی دۆسیتی و رۆمانو لە ساڵی ١٩٩٤ قەشە باوکەکە بە رۆمانوی راگەیاندبوو کەوا ئەو لە رەوشە گشتییەکەی وڵات نیگەرانە چونکە هەست دەکات کەس لە کۆمەڵگەی ئیتالیا لە ناو دەسەڵاتدا بوونیان نییە، بۆیەش ئەو ئارەزوومەند بووە کەوا دەزگا سیاسییەکان لە پاش سەرهەڵدانی گەندەڵییەکان بەرادەیەکی زۆر لە ناو دەزگاکانی دەوڵەت و حزبە سیاسییەکان دامەزرێنێتەوە و گۆڕانێک بەرپا بێت.

رۆمانو نووسیویەتی کەوا قەشە باوک داوا لە ئامادەبووان دەکات ئاماژە بەهەموو کەسایەتییە کاریگەرەکان بکەن، هەروەها ناوی هەموو کەسە زیرەکەکانی ناو شارەکان تۆمار بکەن تا بەیەکەوە پێوەندییەکانی کۆمەڵگە و سیاسەت دامەزرێنەوە. بەڵام دیار بوو کەوا پێشنیاز و داواکە مەسەلەیەکی تەجریدی و زەحمەت بوو، نەدەکرا ئەوە مەیسەر بێت، چونکە خەڵکەکە بەگشتی رەشبین بوون، بەڵام بەرنامە و ئامۆژگارییەکان بۆ دوارۆژ بووە بنکەیەکی کارکردن بۆ ساڵانی داهاتوو، لیژنەکان بۆ چەسپاندنی دەستوور بە بەشداریی قەشەباوک دۆسیتی لە هەموو چالاکییەکان دەستبەکار بوون.

قەشە باوک جیوساب لە ئولیڤیتو پێشوازیی گەرمی لە مێوانەکان دەکرد، کارەکانی ئەو لەو شانە بچووکەی کە تەنیا شوێنی یەک سیسەم دەبوو بەردەوام بوو، قسەکانی ئەو هێمای ئەوەی دەگەیاند کەوا وەک حاڵەتی رەهبانەکانی مونتیسول رەوشەکانی بەرەو گۆڕان و هەژان دەبرد. دیمانەکانی پرودی لەگەڵ کەسایەتییە سیاسییەکانی ئیتالی بەردەوام بوو، لەوانە ماسینۆ

دالیما کە یەکێکە لە سەرکردەکانی دیموکراسی چەپ و کۆنە سەرۆک وەزیرانی لە ماوەی سالانی ١٩٩٨ تا ٢٠٠٠ ، بەیارمەتیی قوتابییەکەی ئەندریا بابینی کە بەڕێوەبەرایەتیی دەزگا راوێژکارییەکان و کانزاکانی دەکرد هزر و بەرنامەکان لەلای رۆمانو چەکەرەی دەکرد و گەشەدار دەبوون، بەیەکەوە کێشەو تەنگژەکانی ئیتاڵیایان دەپشکنی، خاڵ بەخاڵ لەسەر ئەو کێشانە رامانیان دەبوو، تا بتوانن بەرنامەیەکی سیاسیی تەواوکەر بەرجەستە بکەن، بەمەرجێک هەموو داخوازییەکانی ئیتاڵییەکان بهێنێتە دی.

بۆ ئەوەی دۆسیەکان و بەرنامەی دیمانەی کەسایەتییەکان ئەندریا بابینی بە هاوکاریی لیسیا میناردی ئەو کارەی مەیسەر دەکرد، بەلام رۆمانو خاڵە گرینگەکانی دیالۆگەکانی سیاسی و ئابووری لە ولاتەکەدا دادەڕشت.

بەرنامەی تەلەڤزیۆنی (سەردەمی بژارەکان) دیدی لەسەر کێشە ئابوورییەکانی ئیتاڵیا رادەگەیاند، ئەوانیش ئەو دوو کەسە بەیەکەوە خشتەیان بۆ نایەکسانییەکانی دادەڕشتەوە، بەتایبەتی مەسەلەی قەرزە گەورەکانی ئەو ولاتە، بەلام رۆمانو تێبینییەکانی لەسەر کێشەکانی کەرتی ئابووری تۆمار دەکرد، هەروەها باسی کەرتی دادیشی کردووە و چارەسەرکردنی دەزگاکانی بە ئاڕاستە و بەرنامەیەکی خێرا بەپێویست زانیوە.

## یەکەم دەرچوونی رۆمانو پرودی

بەڕێوەبەری گۆواری لاگازات دو ریژیو، ئومبارتو بوناڤینی سالانە وەک کەسایەتییەکی ناوداری شاری ریژیو ئیملیا دیمانەی رۆمانو پرودی کردووە، بەلام ئەو دیمانەی لە مانگی ئۆگستسی ساڵی ١٩٩٤ ئەنجامی دابوو، ئەوەش یەکەمین لێدوانی سیاسی بۆ رۆمانو پرودی ئەژمار دەکرێت، بەلام دیمانەکە لەسەر شێوەی دیالۆگ نەبوو، بگرە لەسەر داوای ئەلساندرۆ کاری سەرۆکی شارەوانییەکە کاربینیتی داوا لە بەڕێوەبەرەکە کرابوو دیمانەکە بکاتە دیمانەیەکی گشتی، بەڕێوەبەرەکە دیمانە گشتییەکەی لە ناو باخچەی سەیرانگەی ڤالیسترا کردبوو.

لە درێژەی دیمانەکەدا ڕۆمـانو پرودی باسـی ڕەوشـی ئابووریی ئیـتـاڵیـای کردبوو، تا ڕادەیەک گەیشتبووە سەر ڕەخنەکردنی حکوومەتەکەی برلۆسکۆنی لەوێ بەئاشکرا و ڕاشکاوانە وتبووی من نیـازم هەیە بێـمـە ناو ملمـلانێـیـە سیاسییەکە، ئەوەش بەئاراستەیەکی ڕاستەوخۆ دەکەم چونکە دیارە کەوا ڕەوشی ئابووریی وڵاتەکە لارە و من نیازم هەیە پڕۆژەیەکی نوێی سیاسی ساز و ئامادە بکەم. بەڕێوەبەری گۆواری دو ریژیو دەقی دیمانەکەی ڕەوانەی هەموو ئاژانسی هەواڵەکان کردبوو، ئەوەش وەرچەرخانێکی وەرزەکەربوو، لەو ڕۆژەوە چالاکیی سیاسیی ڕۆمانو پرودی دەست پێ دەکات، لە دوای ئەو دیمانەیە و لە سەردانێکی بۆ بەرشلۆنەی ئەسپانیا هەڤپەیڤینێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی بابیسی ئەسپانی کردبوو. لەو دیمانەیەدا ڕۆمـانو جەختی لەسـەر ئەوە کردووە کەوا دەبێ ئەو گرێیە بکرێتەوە کە دەروازەیەک بدۆزێتەوە بۆ بەڕێکردنی کێشەکان تا وڵاتەکەمان بەشێوەیەکی باشتر بەڕێوە بچێت، ئەوەش مانای ئەوە بوو کەوا ڕۆمانو ئامادەیە بەرنامەڕێژی بکات کێشە ئابوورییەکان و کۆمەڵایەتییەکانی ئیتاڵییەکان چارەسەر بکات، فلافیای هاوسەری وتوویەتی کەوا بەرنامەکانی هاوسەرەکەی لەودەمـانە پراکـتـیک بووە نەک بەرنامـەی سـەر کـاغـەز، ئەو بەرنامەیەکی نوێی بۆ ئیتاڵیا پێ بووە، چونکە بەرنامەکانی پێش ئەو لە دیدی دەنگدەرە ئیتاڵییەکان بە مردوویی هاتووەتە بوون، بۆیەش ئەوان چاوەڕوانی باشتر و گونجاوتر دەکەن تا هەموو لایەک خۆشگوزەران بکات و بەردەوامیش ببەخشن.

## ئۆلیڤۆ یان زەیتوون

ڕۆمـانو لە دەسـتـەواژەیەک دەگـەڕا تـا لە دامـەزراندنەوەی ئیـتـاڵیـا بەکـاری بهێنێت، لەو دەمـانـەشـدا ڕۆژنـامـەکـان قـسـەی وایان دەکـرد کـەوا ڕەنگە لەو مـاوەیەدا چەند حـزبێک بەرەیەکی ئۆپۆزسیـۆن لەلایەنە ڕاسـتـڕۆکـانی ناوەند ڕابگەیێنن، دەنگۆی ئەو بـەرەیە زۆر بـەخـێـرایی بڵاو دەبووەوە، پاش ئەوەی جیـوفاتی بیانشی کە پەرلەمـانـتـارێکی سـەر بـە حـزبی میللی بوو ناوەڕۆکی

کۆبوونەوە نارەسمییەکەی ئاشکرا کردبوو کە لەگەل رۆمانو پرودی و چەند سیاسەتمەداری تر کردبوویان، لەوێدا وترابوو:

ئەگەری ئەوە هەیە هەڤاڵبەندییەک لە نێوان هێز و حزبە سیاسییەکان لەدایک ببێت، رەنگە ئەوان لەو هەڤاڵبەندییەدا رۆمانو پرودی بۆ پۆستی سەرۆک وەزیران کاندید بکەن.

ئەو هەواڵە لەلایەن رۆژنامەکان بەشێوەیەک بڵاو کرایەوە بەهیچ شێوەیەک رۆمانو چاوەڕوانی نەدەکرد، کە تێدا وتبوویان کەوا رۆمانو خۆی هاویشتووەتە ناو ئاگری شەڕەکە، ئەو رستەیەش لەلایەن برلۆسکۆنییەوەش بەکار هاتبوو، ئەوەش مانای ئەوەی دەگەیاند کەوا پرودی هاتووەتە ناو سیاسەت.

ئەگەرچی هێرشێکی توند دەکرایە سەر رۆمانو پرودی، لەولاشەوە ژمارەیەکی زۆر فاکس و نامەی پشتگیری بۆ ئەو رەوانە دەکران و دەگەیشتنە نووسینگەکەی ئەو لە شەقامی کاریولی لە پۆلۆنیا، هەموو لایەک لەگەڵ ئەوەدا بوون ئەو بەشداریی ئەو گیانبازییە بکات و بچێتە ناو گۆڕەپانی سیاسەت، رۆژ بەرۆژ بزاڤەکەیان گەشەی دەکرد و گەورە دەبوو، بۆیەش پێشنیاز دەکەن کۆمەڵەیەک بەناوی (ئیتاڵیامان وا دەیەوێت) لە مانگی فیبرایەری ساڵی ١٩٩٥ یەکەمین دیمانەی رۆژنامەگەرییان ساز بکات، پاشان هەریەک لە حزبی دیموکراسی ئیشتراکی و کەسک و حزبی میللی و بزاڤی ئاینی و ئیشتراکییەت دەبنە ئەندام لەو کۆمەڵەیە. لەو دەمانە بوو کە زاراوە و ناوی ئۆلیڤۆ یان زەیتوون پەیدا بوو.

فلاڤیا دەڵێت:

لە ماڵەوە رۆمانو لەگەڵ دەستەیەک لە یاریدەرەکانی لە پۆلۆنیا، سازکارییان دەکرد تا بەیانی کۆڕە رۆژنامەگەرییەکە بکەن، لەو دەمانە بیریان لەوە دەکردەوە زاراوەیەک بدۆزنەوە ببێتە ناو و هێمای پرۆژەکەیان، بێگومان سندیان رەمزی دیموکراسییە چەپەکان بوو، ئەوەش بوو کە بیرۆکەی ئەوەی بۆ

خۆش کردین ئەوانیش رووەکێک بکەنە دروشمەکەیان. فلاڤیا دەڵێت بۆ ئەوەش دەبووایە خەسڵەتەکانی داری زەیتوون باش بزانین، ئەو دارە لە ناوچەکانی دەریای ناوەڕاست دەڕوێت و رەگی زۆر دەچێتە ناخی زەوی، لە قەدەکانیشیدا گرێی کەمە، بەڕاستی ئەو وێنەی دەگەیاند کە ئێمە مەبەستمان بوو، کە شتێکی بەهێزە و لایەنی ئاڵۆزیشی کەمە. کەسیش بیریان لەوە نەدەکردەوە کەوا بزاڤەکە ببێتە بزاڤی زەیتوونەکە، ئەوەی لە ماڵی رۆمانو قسەی لەسەر کرابوو تەنیا رامان و قسەی سەر زاران بوو، بەڵام کە رەمزەکە سەر دەکەوێت و دەبێتە راستییەکی گەورە، بۆیەش ناوی لێژنەکانی پرودی دەبێتە لێژنەکان لە پێناوی زەیتوون.

## لە ناو پاسەکەدا

رۆمانو پاش ئەوەی کێشەکانی وڵاتەکەی دەستنیشان دەکات، کۆشش دەکات تواناکانی وڵاتەکەی بدۆزێتەوە، بۆیەش دەبووایە سەردانی شارەکانی ئیتالیا بکات تا لە نزیکەوە ئاگەداری وردەکارییەکانی رووداوەکان بێت، بەڵام نەیتوانی سەردانی ئەو سەد شارە بکات کە بەنیاز بوو سەردانیان بکات. ئەویش وەک چۆن سەرۆکە ئەمەریکییەکان لەو سەفەرانەدا دەیکەن، پاسێک لە رۆژانی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا بەکاری دەهێنن، هەر ئەو پاسانەش دەکەنە نووسینگەی کاری خۆیان، پاش ئەوەی نۆسمینای یاریدەرەکەی کۆنە پاسێکی کۆنی بۆ ساز دەکات، کە تێدا ئامێرێکی فاکس و مێز و سەلاجەیەک و کۆمپیوتەرێکی تێدا دادەنێت، لە رووی دەرەوەی پاسەکەش وێنەیەکی گەورەی پرودیش دادەنێت. یاریدەری دووەمیشی جیولیو سانتاگاتاش وێستگەکانی کۆنترۆڵ دەکرد کە دەبووایە لێی بوەستن.

فلاڤیا وتوویەتی:

لە هەموو وێستگەکاندا شرۆڤەی کێشە ئاڵۆزەکانمان دەکرد، هەر لەوێ پێوەندیمان بە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیی ناوچەکە دەکرد و باسی ژان و مەینەتییەکانی هاووڵاتییانم دەکرد، بەڵام ئێمە زۆرتر بایەخمان بەلایەنی

ئابووری دەدا، لەبەرئەوەی رۆمانو لە خەسڵەتەکانی جوگرافی و ئابووریی ناوچەکانی ئیتاڵیا شارەزا بوو، بۆیە دەکرا باش و ورد دەرزە لاوازەکانی کارنامەی حکوومەت دەستنیشان بکرێت.

بەو سەفەرەی رۆمانو بە کۆنە پاسەکە توانرا بوو زۆرترین زانیاری و دەرهاوێشتەکان لەسەر دروستیی رەوشەکە بزاندرێت، هەر ئەوەش بوو توانرا کۆی پێشنیازەکان و بەرنامەکانیش دیار بکرێت، لەو کاروانەدا کەسانی پسپۆڕ لە هەموو بوارە هەستیارەکانی ژیان و کۆمەڵایەتیی هاوولاتییان هاوشان بوون، بۆیەش دەکرا لە کۆبوونەوە درێژەکەیان لەگەڵ خەڵکەکە باس لە زۆر لایەنی هەستیار بکرێت، لەوانەی هاوشانی ئەو بوون، جیوفاتی ماریا فلیک و ستیفاتو زاماقنی و لویژی سبافانتاو لۆرا مارشینی و جیاتی بونفیسینی و ڤالیریو ئونیدا، ئەوانە لە زۆربەی بوارەکاندا پسپۆڕ و لێزان بوون. پاش ئەو کاروانە و لە رۆژی ٦ی مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٩٥ هەموو پێشنیازەکانی خەڵکەکە بەناوی ئۆلیڤۆ بڵاو کرانەوە، کە ژمارەیان دەگەیشتە ٨٨ پێشنیاز، هەڤاڵبەندیی حزبەکان کە لەو پرۆسەیەدا بەشدار بوون پێشنیازەکانیان پەسند کردبوو کەوا ببێتە بەرنامەی یەکەمی رۆمانو پرودی بانگەشەی هەڵبژاردنی سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیای پێ بکات و بێتە مەیدانی هەڵبژاردن.

## سەردەمی بژارەكان بەهرەكانی راهێنا بوو بۆ تێكەڵبوون بە میدیاكان

ئەو چەند جار لە بەرنامەی تەلەڤزیۆنی (سەردەمی بژارەكان)دا دیمانەی كردبوو، لەوێ لەوە راهاتبوو چۆن بكەوێتە ناو مەیدانی میدیا و بە چ شێوەیەك دیالۆگەكان ئەنجام بدات، لە میدیای بینراو و بیستراو و نووسراو شارەزا بووبوو، بە قسەی هاوسەرەكەی فلاڤیا ئەو لە خۆسازكردن بۆ بەردەم كامێرای تەلەڤزیۆن راهاتبوو، دەیزانی كێ بكاتە یاوەری خۆی، بەردەوام ئەو كەسەی لەو بوارەدا هاوكاری بوون هەر ئەو دوو كەسە كاریان لەگەڵدا دەكرد، ئەویش (سیلڤیو سیركانا) و (نان گرینیاڤینین)، بێجگە لەو دوو كەسەش چەند كەسێكی لێزان لە بوارەكانی تر هاوكاری دەبوون، لەوانە هاوڕێیە پسپۆڕەكەی لە نەخۆشییە دەروونییەكان (ڤیتورینی ئەندریولی)، ئەو زۆر یارمەتیی ئەوی داوە و ئامۆژگاریی لە رووی زانیاریی دۆزینەوەی رەوشتی خەڵكەكەی كردووە، بەوەش لە مەبەستی كەسی بەرامبەرەكەی لە كاتی دیالۆگدا بەدروستی تێ گەیشتووە.

رۆمانو لەسەر جۆر و شێوە پێوەندییەكان و گوزارشتكردن لە بۆچوونەكانیدا رەخنەی توندی ئاراستە كراوە، بەتایبەتی كە وەك مامۆستایەك دەجوولایەوە، چونكە ئەو ماوەیەكی زۆر وانەبێژ بووە لە زانكۆكاندا، ئەگەرچی زۆر رەخنە كراوە بەلام ئەو گوێی نەداوەتە رەخنەكان، وەك مامۆستایەك هەڵسوكەوتی كردووە.

فلاڤیا دەگێڕێتەوە كەوا ئەو رۆژەی رۆمانوی هاوسەری لە رۆژانەی هەڵمەتی هەڵبژاردنەكەدا دیمانەی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ (سیلڤیو برلۆسكۆنی)دا هەبوو، كە بوویتە ڕووبەڕووبوونەوەیەكی توندكار و هەردوولا زۆر رەق بوون،

بەتایبەتی لەو بەشەی کە بایەخ بە وەرگرتنی باج درابوو، دیمانەکەش لە بارەگەی کۆنفدرالیەتی کشتیی بازرگانی لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٩٦ ساز کرابوو. لەوێ رۆمانو نەیتوانی هەڵوێست و بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بە سیستەمی باج روون بکاتەوە و باش شرۆڤەی بکات، کە بەتوندی رەخنەیان لەسەر شێوەی کارنامەی ئەو هەبوو لە کاتی بەڕێوەبردنی ئامۆژگەی بنیاتنانەوەی پیشەسازی. لەوێ رۆمانو هەموو توانا و وزەکانی کۆ دەکاتەوە بۆ سەرکەوتن لە داڕشتنی ستراتیجیەتی میدیایی نوێی هاوسەنگدا. ئەگەرچی رۆمانو لە رۆژانی هەڵمەتەکە زۆر ئەکتیڤ بووە و هاوڕێیەکانی پشتیوانیی زۆریان کردووە، بەڵام هاوسەرەکەی رەشبین بووە بەوە کەوا ئەو بتوانێت بەسەر برلۆسکۆنیدا زاڵ بێت، بەڵام هاوڕێیەکانی وەک هاوسەرەکەی رەشبین نەبوون، پشتیان بە تواناکانی رۆمانو ئەستوور بوو.

لەو دەمانەی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکە رادەگەیەندرێت، رۆمانو و فلاڤیا کە لە ماڵی ماریزای هاوڕێیان سەیری ئەنجامەکانیان دەکرد، بڕوایان بە سەرکەوتنی رۆمانو نەدەکرد، لە دەرەوەش لە گۆڕەپانی ئەقلدیس ئوبوتر لە رۆژی ٢١ی مانگی ئەپریلی ساڵی ١٩٩٦ جەماوەرێکی زۆر بۆ پیرۆزکردنی ئەنجامەکان ئامادە بوون. لە رۆژی ١٧ی مانگی مایۆدا ئەندامانی حکوومەتە نوێیەکە بە سەرۆکایەتیی رۆمانو پرودی سوێندی یاسایی دەخوات، پاشان سەرۆک وەزیران وتارەکەی خۆی پێشکێشی ئەنجوومەنی نەتەوەیی دەکات، لەوێدا جەخت لەسەر بایەخدان بە جۆرەها بەرنامە و پرۆژەی تایبەت بە ژیانی رۆژانەی خەڵکەکە تا کەرتی تەندروستییەوە و خوێندن و ئیدارە گشتییەکانیشەوە دەدات.

## شیوعییەکان بڕوا پێکردنەکەیان لە پرودی دەکێشنەوە

پاش چەند رۆژ لە ململانێ و ناکۆکییە دژوارەکان سەردەمی یەکەمی حکوومیی رۆمانو پرودی لە رۆژی ٢١ی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٨ کۆتایی دێت، تەنگژەکە لە سەرەتای مانگی ئۆکتۆبەرەوە سەرهەڵدەدات کە

لێژنەی سیاسیی دووبارە دامەزراوی حزبی شیوعی متمانەکەی خۆیان لە ڕۆژی ٩ی مانگی ئۆکتۆبەر دەکێشنەوە و بڕیار دەدەن متمانەکەیان بە حکوومەت نوێ نەکەنەوە.

ڕۆمانو پرودی دەیزانی بۆی مەیسەر نابێت ڕەزامەندی و پشتیوانی زۆرینەکە وەرگرێت، چونکە ئەندامانی هەڤاڵبەندییەکە لەسەر بڕارەکان کۆک نەبوون، پاش دیالۆگێکی زۆر نەکرا پەیامی ناوەندەکان و چەپەکان یەکڕیز بکرێت. لە ناو دەستەی هەڤاڵبەندییەکە دوو هزر و بۆچوونی جیاواز هەبوون، یەکەمیان قسەیان لەسەر هەڤاڵبەندییەکی حکوومیی سادە دەکرد، بەشی دووەمیان لەگەڵ بوونی پەیمانێک بوون لە ناو بەرەکە کە تێڕوانینی نوێیان بە شێوەیەکی بابەتییانەی سیاسی هەبێت و هەڵگری ئۆلیڤۆ بن، بەمەرجێک هەموو حزبە سیاسییەکان ناسنامە و تایبەتمەندییەکانی خۆیان تێدا بپارێزن.

ئەو گۆڕانەی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی لە ئیتاڵیا هاتبوونەتە پێشەوە بوارساز نەبوو، ئەو بتوانێت زۆرینەی ناو پەرلەمان دەستەبەر بکات، نەدەکرا ڕۆمانو پرودی هێڵە سیاسییەکان یەک بخات، ئەو ڕەوشەی بۆ ئەو ئاسانکاریی بردنەوەی هەڵبژاردنەکانی کردبوو نەمابوون، بۆیەش بەرنامە و هێڵەکەی ئۆلیڤۆ دەوەستێت، هۆکارەکەش نەمان و نەبوونی یەکدەنگی بوو تا بتوانێت سیاسەتی ئەو ڕۆژەی ئیتاڵیا پابەند بکات.

بۆ دانانی یەکڕیزیی سیاسی و نوێکردنەوەی بەرنامەکە لە ساڵی ١٩٩٩ بڕیار دەردێت حزبی دیموکراسخوازەکان دابمەزرێت، ئەوەی لە کاتی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئەورووپی دەکارێت ڕێژەی ٨،٧٪ دەنگ وەرگرن، ئەوەشیان ئاماژەیەکی باش بوو کەوا بزاندرێت بەرنامەکەی جارانی ڕۆمانو پرودی هێشتا جێگەی متمانە و بڕوای ئیتاڵییەکانە، بەڵام پرودی کاروانەکە لەگەڵ دیموکراسخوازەکان تەواو ناکات، چونکە ئەو لە ڕۆژی ٥ی مانگی مایۆدا لەلایەن ئەنجوومەنی سەرۆک وەزیرانی ئەورووپییەوە داوای لێ دەکرێت ببێتە سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئەورووپی.

## ڕۆمانو دەبێتە سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئەورووپی

پاش چوار مانگ ڕۆمانو پرودی لە بەردەم ئەندامانی پەرلەمانی ئەورووپی لە شاری ستراسبۆرگی فەرەنسی سوێندی یاسایی دەخوات و کارنامەی خۆشی دەخوێنێتەوە. فلاڤیا لەگەڵ دوو کوڕەکەی لەو دانیشتنەدا ئامادە دەبن، ئەو پێشهاتەی بە ڕووداوێکی مێژوویی پێناسە کردووە، ئەو وتوویەتی:

کە دراوی یۆرۆ وەک پارەیەکی یەکگرتووی ئەورووپی پیادە دەکرێت و دە دەوڵەتی ئەورووپی شانازیی بەکارهێنانی پێ دەکەن، توانا و کارنامەکانی هاوسەرەکەم دەردەکەوێت. ئەوە و دەستووری ئەورووپی و کۆشش بۆ ڕێنوێنییەکانی تری حکوومداری پیادە بوون. بەوەش یەکەتییەکە دەستووری کار و دەسەڵات دەداتە هەموو دەزگاکانی یەکەتییەکەیان. فلاڤیا دەڵێت کارکردن لە بەرپرسیاریەتیی ئەو یەکەتییە ئاسان نەبوو، دەبووایە ئەو وەک سەرۆک مامەڵە لەگەڵ کولتووری زۆر بکات، ئەو میللەتانە باکگراوندی جیاوازیان هەبوو، لە زۆر تێڕوانین و بەرنامەدا لەیەک دوور بوون، کار و ئەرکەکە سووک نەبوو، دەبووایە لە کاتی ڕۆژانەیاندا بە سێ زمانی جیاواز کار بکەن، ئەو لە نووسینگەکەی خۆیدا زمانی فەرەنسیی بەکار هێناوە و زمانی ئینگلیزیی لەگەڵ کارنامەی لێژنەکان بەکار هێناوە و بە زمانی ئیتالیشی لە ناو پەرلەماندا قسەی کردووە. ژنەکە دەڵێت ڕۆمانو پاش کارکردنی بەردەوام و زۆری ڕۆژانە ئەو ماوەی پێنج ساڵ لەو پۆستە بووە، ئەو ڕۆژەی وتاری کۆتاییی بۆ پەرلەمانتارە ئەورووپییەکان خوێندووەتەوە بە چەپڵەڕێزان بەرێ کراوە و هەموویان بە هیوای دوارۆژی گەشی کارەکانی بەپێوە بۆی هەڵدەستنەوە و لە برۆکسل ماڵئاوایی لەو دەکەن.

## بەرنامەی کارگەکە

ڕۆمانو لە پاش دە ساڵ لە یەکەم ئەزموونی سیاسەت و خۆکاندیدکردن دووبارە دەگەڕێتەوە سەر کاری سیاسی، بەڵام ئەوجارە بە شێوازێکی تر و بە

ئەزموونێکی نوێیەوە دەکەوێتەوە کارکردن، چونکە لەو پرۆسەیەدا ئەو ڕووبەڕووی هەڤاڵبەندی لە پێناوی ئازادیدا دەبێتەوە، هەروەها دەبێ بوارێک بدۆزێتەوە کە هەموو لایەنە حزبییەکان و هێزە سیاسییەکان بە شێوەیەکی کاریگەرتر ساز بکاتەوە، تا بکارێت سەربکەوێت و حکوومەتێکی تری بنکە ئارام و ئەکتیڤتر دامەزرێنێت، بۆیەش بیرۆکەی بەرنامەی کارگەی لەلایەن خولیو سانتاگاتاوە بۆ پێشنیاز دەکرێت، کە بیکاتە بەرنامەی هەڵبژاردنەکەی، ئەویش بوار بدرێتە کرێکاران هەریەکە و ماوەی پێنج دەقە باس لە کێشە و داواکانیان بکەن، لەو ماوەیەدا پێشنیازەکانیان ئاراستە بکەن، ئەوەش لە ناو شوورەکانی پەرلەمانی ئەورووپی پێڕەو کراوە، بەوەش دەنگە پشتیوانەکانی دووجار زۆرتر دەبێت. لە سەرەتا بیرۆکەکە کێشەی دێتە پێشەوە، بەڵام دوایی کرێکارەکان بیرۆکەکە بەباش دەزانن و هەواڵەکە بڵاو دەبێتەوە، تا ڕادەیەک کارگەکان خۆیان داوا دەکەن ئەو بڵندگۆیە بگاتە هەموو کارگەکان، ئەوە و چەند بیر و هزری تر کە پرودی و کەسە نزیکەکانی پێشنیازیان کردبوو دەبێتە دەستپێکێکی زیندوو و کاریگەر، بەتایبەتی ئەو دەمانەی ڕۆمانو لە برۆکسل بووە گۆڕان و پێشهاتی زۆر لە ئیتاڵیا ڕووی داوە.

بەو کارە و بە چالاکییەکانی ڕۆمانو پرودی دەتوانێت پشتیوانی یەکەتییەکە بەدەست بهێنێت، ئەوەی بە زمانی ئیتاڵی (یونیون)ی پێ دەڵێن، کە تێدا حزبە چەپەکانیشی تێدایە. کێشەی سەرەکییان ئەوە بوو چۆن بتوانن لە ئۆلیڤۆ دەربازیان بێت، بۆ ئەوەی شەڕی هەڵبژاردنە ناوخۆییەکەی ئیتاڵیا کە لە ڕۆژی ١٦ی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٥ ئەنجام درا، ئەوەش بەسەرهاتی خۆی هەیە.

## وەستان بە ڕووی پڕوپاگەندەکان

ژیانی سیاسیی هەموو کەسێک کار دەکاتە سەر ژیانی تایبەتی سیاسییەکان، بۆیەش چ ژن یان پیاو ناتوانن خۆیان لەو کێشە و نارەحەتییانەی لەو ڕەوشە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە چارەسەر بکەن. لەو ڕووەوە

فلاڤیا وتبووی:

که مێردەکەم سەرۆک وەزیران بوو، لە دیمانەیەکی تایبەتی و لە ماڵەکەی ئەودا، من پەلەم کردووە و بە بیرو شیامبریتیم وتووە:

وا بزانە من لێرە بوونم نییە.

بەڵام راستییەکەی وا نییە من فلاڤیا وەک هاوسەری ئەو بەردەوام هاوشانی ئەو بووم، بەڵام بڕوا بکە پڕوپاگەندە ئەوەندە زۆرن، ئەوانەش باندۆری گەورە و زۆریان هەبووە. بۆیەش وتبووی:

هەر ژنێک بیەوێت یارمەتیی مێردەکەی بدات، وەک من ئێستا، ڕووبەڕووی زۆر تەنگاوکردن و توانج دەبێتەوە، دیارە ئەوەش لە ئیتاڵیا دەبێت، چونکە هاوسەری ژنە حاکمەکان رۆڵی تایبەتییان نابێت، وەک چۆن لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ نموونە ژنەکان رۆڵیان هەیە و گرینگییان پێ دەدرێت.

نازانم کەسانی دەنگدەر مافی ئەوەیان هەیە هەموو لایەنە تایبەتییەکانی ئەو کەسانە بزانن کە دەنگیان دەدەنێ، من وا دەزانم ئەوەی زۆر گرینگە لە بەرنامەکانیان ئاگەدار بم، بزانم چییان لەدەست دێ، بۆیەش من خۆم لەوە دوور ڕادەگرم بۆ رۆژنامەکان لێدوانێک بدەم، بەڵام لەبەرئەوەی من نازناوی پرودییم پێوەیە و لەگەڵ ئەودا هاوشانم حەقی ئەوەم هەیە لە کۆنگرەکاندا لێدوانێکیش بدەم، یان لە دیمانەیەکی ژوورنالیستیدا قسە لەسەر مەسەلەیەکی هەستیاریش بکەم. کە من رازی بووم کتێبێک بنووسم، مانای ئەوەیە کەوا من رەووشتم بەو پۆستە و بە پێشهاتەکانی رابردوومان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، من دەڵێم وەک جاران نەماوم، منیش زۆر لایەنی ژیانم گۆڕاوە، بەڕاستی من لە ستوونی رۆژنامەکان بێزار دەبووم، لە نووسینەکان نیگەران دەبووم کە دەمبینی بەناحەق هێرشمان دەکەنە سەر و توانجمان تێ دەگرن، چونکە هێرشەکان دوور بوون لە چەکە ئاساییەکان کە لە ژیانی سیاسیدا بەکار هاتوون.

فلاڤیا ئەو ڕۆژانەی لە بیرە کە کەناڵە تەلەڤزیۆنە ئیتاڵییەکان چ جۆرە هێرشێکیان دەکردە سەر چەپە ناوەندەکان و سەر ڕۆمانو پرودی، دنیایان دەورووژاند و ئارامبوونەوەیان نەبوو، بەتایبەتی کە بە کێشەی تیلیکۆم سربیا تاوانبار کرابوون، لەو دەمانە ڕۆژنامەکان نووسیبوویان:

ئەو ڕۆژانە سپۆرتی جمباز دەکات، بەڵام نازانێت چێشتێک لە مەتبەخەکەیان بۆ خۆی ئامادە بکات.

فلاڤیا ئەو جۆرە نووسینانە و توانجانەی ڕۆژنامەکانی بە درۆی سادە ناو بردبوو، بەڵام زۆریش بێزاریان کردووە، چونکە لە ڕۆژنامەکان مەبەستیانە وێنەیەک بۆ ئەو ساز بکەن، گوزارشت لەو بکات.

بەڵام مەسەلەکە لە درۆیە سادەکان نەوەستا، مەسەلەکە دوورتر پەلی هاویشتبوو، فلاڤیا دەگێڕێتەوە کەوا جارێکیان من خۆم گوێم لێ بوو گایدێکی گەشتیارەکان پەنجەی بۆ کۆشکی نزیک گۆڕەپانی (سانتو ستیانۆ) درێژ دەکرد، کەوا ئەو کۆشکە کۆشکی ڕۆمانو پرودییە، بەڵام ئەو دەڵێت من و هاوسەرەکەم لە شوقەیەکی گچکەی پشت کۆشکەکە دەژیاین کە دەیڕوانییە هەمان ئەو گۆڕەپانە. فلاڤیا هەر لەسەر مەسەلەی گایدە گەشتیارەکان نووسیویەتی:

یەکێک لە دەستەخوشکەکانی بۆی گێڕاوەتەوە، کەوا جارێکیان لە یەکێک لە گایدەکان لە شاری براغ بیستوویەتی کە دەیوت:

ڕۆمانو پرودی سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئەورووپی یەکێک لەو کۆشکە گەورانە موڵکی ئەوە، یان وتبوویان ئەو لەگەڵ مێردەکەی پشکیان لە دەزگایەکی گەورەی سیرامیک و مەڕمەڕدا هەیە.

فلاڤیا بەو هەواڵەی لە ڕۆژنامەکان بڵاو کرایەوە زۆر بێزار و نارەحەت بووبوو کە وتبوویان کەوا ئەو ژنەی کوڕەکەی خۆی کوشتووە لەگەڵ ئەواندا خزمایەتییان هەیە، چونکە هەمان نازناویان پێوەیە، هەروەها ڕۆژنامەکان نووسیبوویان لەبەرئەوەی ژنە بکوژەکە خزمایەتیی لەگەڵ ئەو بنەماڵەیەدا

هەبووە، بۆیە دادگەش چاوپۆشیی لە جۆری سزای تاوانبارەکە کردووە، چونکە ژنەکە لەگەڵ سەرۆک وەزیران خزمن. بەڵام فلاقیا وتوویەتی ئەوان لە دوور و نزیکەوە ئەو ژنەیان نەناسیوە و بە هیچ شێوەیەک خزمایەتییان لەگەڵدا نییە، بۆ زۆرتر زانیاریش هەردووکیان لە دوو شوێنی زۆر دوور لەیەکەوە هاتوون.

## پێوەندیی فلاڤیا و رۆمانو
## بە شیراک کێشەکانی ئەلبانیای چارەسەر کردووە

ئەو ژن و مێردە ماوەیەک لە رۆما و برۆکسل ژیاون، ئەزموونی ئەو دوو شوێنە لەیەک جیاواز بوون، چونکە رۆمانو لەو دوو پۆستەدا کارەکانی جیاواز بوو، دوو ئەرکی جیاوازی لەسەر شاندا بوو، کە لە پۆستی سەرۆکایەتیی وەزیران بووە لەگەڵ هاوسەرەکەی رۆمانو لە شوقەیەکی ناو چەندین نووسینگە و لە نهۆمی سێیەمدا ژیاوە، باڵەخانەکە دەکەوتە بەرامبەر کۆشکی (شیجی) کە تایبەتە بە بارەگەی سەرۆکایەتیی وەزیران لە ئیتاڵیا، شوقەکەیان بریتی بووە لە ساڵۆنێکی گەورە و هۆڵێکی نانخواردن و ژوورێکی گچکە کە لەسەر دیوارەکانی تابلۆیەکی هونەرمەندی ئیتاڵی (دومینیکۆ زامبیرینی) پێدا هەڵواسرا بوو، هەروەها بێجگە لەو ژوورانە ژوورێکی نووستنی گەورەشی تێدا بوو، ئەوان کە شوقەکەیان وەرگرتووە هەموو کەرەستەکانی کۆن بووە.

فلاڤیا وتوویەتی کە کورەکانمان مێوانمان بوون بەناچاری سیسەممان لە ژوورە گچکەکە بۆ دەگوازتنەوە، لەو شوقەیەدا خاتوونی یەکەمی وڵات ئەو شوێنەی تەنیا بۆ دیمانە رەسمییەکان بووە، یان لە کۆبوونەوە رەسمییەکان بەکاری هێناوە، ئەو شوقەیە دەرگەیەک بە هۆڵێکی گەورەی کۆبوونەوەکانی دەبەستەوە، کە کرابووە بارەگەی دانوستاندنەکان کە لەوێ کۆبوونەوەکان لەگەڵ حکوومەت و سەندیکا و پاترونا (پیاوانی کار) دەکرا.

کە رۆمانو دەبێتە سەرۆک و جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران ئەو ژن و مێردە لەو شوقەیەدا ژیاون، چونکە لە ناو رۆمادا هیچ موڵکیان نەبووە، ئەگەرچی بینایەکە مۆرکێکی رەسمیشی هەبووە، بەڵام ئەوان ژیانیکی ئاساییان تێدا بەڕێ کردووە و ژنەکە دەڵێ ئێمە لەوێ هەموو دەقەیەک کار و

نیشمان هەبووە.

لە برۆکسل ئەو ژن و مێردە لە شوقەیەک ژیاون کە ڕووبەرەکەی تەنیا ١٣٠ مەتر دووجا بووە، شوقەکە لە نهۆمی هەشتەمین بووە و باڵەخانەکە لە تەنیشت حەسارێک بەناوی (پێنجینەکەی نگیر) و لە شوێنێک بوو کە لە بارەگەی کۆمیسیۆنی یەکەتیی ئەورووپی دوور هەڵکەوتبوو، لەو شوقەیەدا ژووری نووستنی یەدەگی بۆ منداڵەکانیش هەبوو، فلاڤیا زۆر دڵی بەو شوقەیەی برۆکسل خۆش بووە، ئەو دەیوت ئەو شوقەیە وەک بۆ من دروست کرابێت وابوو، بەڵام شوقەکەی ناو کۆشکی سەرۆکایەتیی وەزیران بۆ کۆشکی شیجی دروست کرابوو.

## سەرۆکی کۆمەڵەی ژنانی ئەورووپی

ئەو ماوەیەی هاوسەرەکەی سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئەورووپی بووە، فلاڤیا کراوە بە سەرۆکی شانازیی کۆمەڵەی ژنانی ئەورووپی، ئەو کۆمەڵەیە تایبەت بووە بەو ژنانەی لە برۆکسل نیشتەجێن، یان لەوێ کارکەرن، ئەوان کار دەکەن کۆمەک بۆ پرۆژە کچکەکان لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو کۆ بکەنەوە، یان ئەو وڵاتانەی ڕووبەڕووی هەژاری دەبوونەوە، ئەوان دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکردن، هەروەها ئەوان پێوەندییان لەگەڵ کەسانی بێگانە و لە ڕەگەزی جۆراوجۆر کە لە برۆکسل نیشتەجێن رایەڵ دەکرد.

فلاڤیا کەم و زۆر بەدەگمەن لە سەردانە رەسمییەکانی رۆمانو پرودی هاوشانی دەبوو، بەڵام لە کۆنگرە لووتکەییەکانی وەک سەرانی هەشت وڵاتە گەورەکە و کۆنگرەی لووتکەییی ساڵانەی وڵاتانی پیشەسازی دەرکەوتووە و هەروەها لە هەندێ لە سەردانەکانی سەرۆک بۆ وڵاتانی ئەورووپی ئەو هاوشانی بووە، دیارە کەوا هاوسەرە ژنەکانی سەرۆکانی وڵاتانی ئەورووپی زۆر بە کەمی لە کۆبوونەوەکانی یەکەتیی ئەورووپی بەشدار دەبوون، چونکە ئەو سەفەرانە کورت بوون و شێوەی سەفەرەکانیش دەوری بووە، بەشداربوونی ئەوانەش بۆ سازکردنی ڕێوشوێنی ئەمنی و هاوڕێیەتیکردنی ژنەکان ئەرکی گران بووە.

فلاڤیا دەڵێ، جۆر و شێوەی کارەکان لە رۆما و برۆکسل جیاواز بوون، هەموو شتەکانمان لە کۆشکی شیجی بەشێوەیەکی ریزپەڕ بۆ ساز دەبوو، ئەوەش بەپێچەوانەی برۆکسل بوو. کارەکانی رۆژانەی پایەتەختی بەلجیکی لە کۆمیسیۆنەکەدا ئاسایی بووە، بەڵام لە رۆما زۆر و چڕ بووە، رۆژانە و لە کاتی هەر پێشهاتێکی ناوەخت و لە ناکاو بەرنامەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، تا بکرێ دەست بەسەر مەسەلەکان دابگیرێت و دەربازیان نەبێت.

بەپێی گۆڕانی پۆست و پێگەکان ئەو وەک هاوسەری سەرۆک وەزیران بەرنامەکانی دەگۆڕان، ئەوەش کارنامەکانیشی دەگۆڕی، بۆیە دەبووایە فلاڤیا پێشوازیی هاوسەری سەرۆک وەزیرە میوانەکانی بۆ ئیتاڵیا کردبووایە، نووسینگەی پرۆتۆکۆلەکان هەموو کاتێ ژیاننامەی ژنە میوانەکەی بۆ ئەو ساز کردووە و زووتر بۆیان ئامادە کردووە تا ئەو ژنە بناسێت، بەوەش بەئاسانی گەیشتوونەتە یەک و ئاخاوتنەکانیان جوانتر بووە.

## دیمانەکەی لەگەڵ برنادیت شیراک

یەکەمین خاتوون وەک هاوسەری سەرۆک وەزیران کە لەلایەن فلاڤیاوە پێشوازی کرابێت خاتوونی فرەنسا برنادیت هاوسەری سەرۆک شیراک بوو، ئەو دیمانەیە لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٦ ساز کرابوو، فلاڤیا بەپەرۆشەوە کاری کردووە دیمانەکەی بەرنامەکانی رێکوپێک بێت، راوێژکارەکان لە کاروباری پرۆتۆکۆلەکان بە فلاڤیایان راگەیاندبوو کەوا ژنی سەرۆکی فرەنسی کاری سیاسەتی کردووە و ژنێکی دیبلۆماتە و نوێنەرێکی هەرێمەکان بووە و لە زانستی شوێنەوارناسیدا شارەزایە و مێژووی هونەریش دەزانێت.

لە پاش ئەو سەردانە و گەڕانەوەی شیراک بۆ وڵاتەکەی ئەو ژنە گەیشتە ئەو قەناعەتەی خۆی باش ساز بکات بۆ ئەو جۆرە دیمانە سیاسییە دوولییانە، زۆر باشیش لە هەموو پێشهاتەکان و گرفتەکانی ناو ئیتاڵیا ئاگەدار بێت، تا لەسەر ئاستی بەرپرسیاریەتی بێت و ئامادەی وەڵامدانەوەی هەموو رامانێک

بێت، لەو ماوەیەشدا بیری لەوە کردووە چۆن خۆی فێری لێدوان بە زمانی ئینگلیزی بکات، تا بتوانێت لەسەر کێشە و پرسیارە هەنووکەییەکان قسەی هەبێت.

## لە کۆشکی سپیدا

سەردانەکەی وەزیری یەکەمی ئیتالی لە سەردەمی بیل کلینتۆن زۆر رەسمی بووە و زۆریش بۆ هاوسەرەکەی کاریگەریی نواندووە، ئەوەیان لە هەموو سەفەرەکانی تری رۆمانو پرودی بایەخدارتر بوو لەو بوارەدا، بە قسەی فلاڤیا ئەو سەردانە لە ئاکامی کار و بەرنامەیەکی زۆر چڕ بووە بۆ دانانەوەی پێوەندییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە، ئەمەریکا و ئیتالیا.

لەو سەفەرەدا خاتوونی ئەمەریکا هیلاری کلینتۆن کۆششی زۆری کردبوو سەردانەکەی هاوسەری سەرۆک وەزیرانی ئیتالیا فلاڤیا زۆر سەرکەوتوو بێت، بۆیەش فلاڤیا کارەکانی ژنە بەردەستەکەی بە ژنێکی پسپۆڕ و لێزان پێناسە کردبوو، خاتوونی یەکەمی ئەمەریکا کاری کردبوو لە بەرچاوی میدیای ئەمەریکی خاتوونی یەکەمی ئیتالیا بەرز دەربکەوێت، چەندین دیمانەی تەلەڤزیۆنی و ژورنالیستی بۆ ساز کردبوو. فلاڤیا سەبارەت بە شێوازی پێشوازییەکە وتبووی، هیلاری کلینتۆن زۆر ئامادەکاری بۆم کردبوو، هەتا ئەو کورسییانەی بۆ من لە دیمانەکاندا ساز کرابوون هەموو ماسوولکەکانی منیان ئارام دەکردەوە، قاچەکانم دەحەسانەوە، لەو دەمانەی بەیەکەوە بوون هیلاری پرسیاری وردی لەسەر ژیانی ئیتالییەکان لەو کردووە، ویستوویەتی بزانێت ئیتالییەکان چۆن لە قوتابخانەکان رۆژانەیان بەڕێ دەکەن، لایەنە تەندروستییەکانیان چۆنە، دەزگا گچکەکان و ناوەندییەکان هەتا ناوچە پیشەسازییەکان چۆنن، ویستوویەتی وردەکارییەکان بە ئامار و بە وردی تێ بگات.

## پێوەندییە تایبەتییەکان و دەولییەکان

لە یادی هەشتا ساڵەی کۆچی دوایی هونەرمەندی کەمانژەنی فەرەنسی مستیسلاف روستوربوفیتش لە پاریس لەوێ سەرۆکی ئیتاڵی و هاوسەرەکەی لەگەڵ سەرۆکی فەرەنسی جاک شیراک و برنادیتی هاوسەری دیمانەیان دەبێت، لەوێ بە شێوەیەکی لاوەکی و بەبێ بەرنامەیەکی داڕێژراو قسە لەسەر کێشەکانی ئەلبانیا دەکەن، ئەو قسە لاوەکییە دەبێتە هۆکار و فاکتەرێک تا کێشەکانی ئەو وڵاتە چارەسەر بکرێت، فلاڤیا ئەوە وەک نموونە دەگێڕێتەوە کەوا زۆرجار دیمانەی رێکەوت و سەردانی بێ بەرنامە کێشە و گرێی ئاڵۆزی کردیتەوە، کە بە دانیشتنە رەسمییە دەولییەکان چارەسەر نەکراوە.

لەو دەمانە وڵاتی ئەلبانیا لە ناو گێژاوێکی ناڕێکدا دەژیا، چەندین خۆپێشاندان لەسەر ئاشکرابوونی چەندین گەندەڵیی دارایی و بەرنامەی ئابووری فاشیل دەکران، لەو ناڕەزاییانەدا خوێنی زۆریش دەڕژا، دەبووایە وڵاتانی ئەورووپی لە ژێر بەرنامەی (ئەلبا) بگەنە ئەو وڵاتە و بوارسازی بکەن بۆ بەرقەراربوونی ئاشتەوایی، دەبووایە سوپای ئەورووپی بۆ ئەو مەسەلەیە بگاتە ئەو وڵاتە، لەو دەمانەدا ئیتاڵیا رادەسپێرن کە لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپییەکان دانوستاندن بکات، بەیەکەوە هاوئاهەنگێک ساز بکەن، لە ئاکامی ئەوەی هیچ لە وڵاتەکانی دراوسێ رازی نەبوو هاوکاری نیشان بدەن، ئیتاڵیا لەو مەیدانە و لە هاوکاریی ئەو وڵاتەدا تەنیا دەمێنێتەوە. فلاڤیاش دەگێڕێتەوە کەوا ئەو بەڕێکەوت سەردانی پاریس دەکات، لە پاش خوانی ئێوارە کە سەرۆک شیراک و هاوسەرەکەی لەسەر شەرەفی ئەواندا سازی کردبوو، بەیەکەوە قسەیان لەسەر ئەو کێشەیە کردووە، بە وردی هەموو لایەنەکانیان شرۆڤە کردبوو، پاش ئەوەی سەرۆکی فرەنسی ماڵئاوایی لە مێوانەکانی دەکات و سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیا بەڕێ دەکات، بڕیار دەدات وڵاتەکەیان لە ژێر چەتری پرۆسەی هاوکاری بەناوی (ئەلبا) بەشداری بکات و هەزار سەربازی فەرەنسی رەوانەی ئەلبانیا بکات، ئەو هێزەش لە ژێر فەرماندەیی سەرکردایەتیی ئیتاڵیادا بێت.

## فلاڤیا و شادوری ئێرانی

پاش چەند ساڵ سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵی رۆمانو پرودی لە ساڵی ١٩٩٨ سەردانی ئێران دەکات، ئەگەرچی سەردانەکە رەسمی بووە بەلام سەردانێکی بەکێشە بوو، مەبەست لەو سەردانە دان پێدانان بوو بەوەی کەوا ئێران بەڕووی دەرەوە دەکرێتەوە و کۆششێکە دەرزەکەی نێوان ئێران و ئیتاڵیا تەسک بکاتەوە، بەتایبەتی لەلایەنی مافەکان و ئازادییەکان. فلاڤیا لەوێ وێنەیەکی بە جلی شادوری ژنانەی ئێرانی گرتبوو، لەسەر ئەو پۆشینە و عەبا لەسەردانانەکە زۆر رەخنەی لێ گیرابوو، ئەوەش پاش ئەوە هات کە رۆژنامە و کۆوارە لۆکالییە و دەولییەکان وێنەکانیان بەو جلەوە بلاو کردیتەوە، ئەودەمانە وا بوو، وەک ئێستا نەبوو، کە دەبینین ژنان کە سەردانی ئەو ناوچانە دەکەن رووپۆش و دەمامک لە ولاتانی ئیسلامی دەپۆشن، بەتایبەتی ژنە ژوورنالیستەکان، لەوانە لە عێراق زۆریان بە رووپۆشەوە دەردەکەون، ئەودەمانە من سەردانەکەی ئێرانم کرد و رووپۆشم لەبەر کردبوو وەک ئێستا نەبوو، مەسەلەیەکی زۆر نوێ و نامۆ بوو، بۆیەش لە زۆر لە دەزگاکانی راگەیاندن رەخنەیان گرتبوو. ئەو کە رەخنەی لێ گیراوە وەلامی داوەتەوە و شرۆڤەی رەوشەکەی کردووە کەوا بوونی ئەو لەو بوارە و کارکردن بۆ گەیشتن بە جیهانی دەرەوە پێویستە، ناکرێ خۆمان تەریک بکەین و پێوەندییەکانمان سنووردار بکەین، رەخنەکەش زۆرتر لەوەدا بوو کەوا لەسەر پۆشینی شادورەکە نەبووە، ئەوەندەی مەسەلەکە لەگەڵ ئەوەدا بوو کەوا بۆ سەردانەکەی سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیا بۆ کۆماری ئیسلامیی ئێرانی مەرجیان هەبووە کەوا دەبێ ژنەکەی رووپۆش بپۆشێت، چونکە لە پاش شۆڕشە ئیسلامییەکە و لە پاش رووخاندنی رژێمی پاشایەتی لە ساڵی ١٩٧٩ رووپۆش بۆ ئەو ژنە بێگانانەی سەردانی ولاتەکەیان دەکەن ئیجباری بووە.

## ئیتاڵیا لە ناوچەی یۆرۆدا

فلاقیا گومانی هەبوو کەوا وڵاتی ئیتاڵیا و هەموو وڵاتەکانی تریش بەتەنیا و دوور لە فەلەکی ئەوروپی بتوانێت کێشەکانی چارەسەر بکات، ئەو هەستی بەوە کردووە، ئەوەشی لە منداڵییەوە لە مزر و مێشکیدا چەقیوە، بەڵام سەری لەوە دەرناچێت ئایا منداڵانی ئەو نەوەیە هەمان سۆز و تێڕوانینیان هەیە، چونکە هیچ کام لەو وڵاتانە نەک تەنیا ئیتاڵیا ئەوانی تریش دوور لە سیاسەتی کیشوەرەکە هیچیان بۆ ناکرێت، تا چارەنووسی خۆیان بە تەواوی کیشوەرەکە نەبەستنەوە.

ئەو ژنە هەر وتوویەتی کەوا هیچ وڵاتێکی ئەوروپی بۆی ناکرێت پێوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دوور لە هەموو ئەوروپا گەشە بکات، یان بۆیان ناکرێ هەر وڵاتە و بەتەنیا جۆری ژیانیان و زۆر لە نەریتەکانیان لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و کولتووری بگۆڕن ئەگەر لە ناو پرۆژەیەکی گەورەی ئەوروپای مەزندا نەبن، بەتایبەتی لەو رۆژانەی لە ئاکامی هەڵاوسانە ئابوورییەکان کێشە و گرفت زۆرن. کە رۆمانو دەگاتە پۆستی سەرۆک وەزیران دەوڵەتی ئیتاڵیا دەگەڕێتەوە سەر گۆڕەپانی ئەوروپی، حکوومەتەکەی توانی ساڵە زەحمەتە ناسازەکان ببڕێت، لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا بۆی نەدەکرا بگاتە پێگەی رێکەوتنی ماستریخت، پاش ئەوەی مەرجەکانی ئەندامبوونی تێدا نەبوو، چونکە میزانییەی بازرگانییەکەی لە ئەنجامی هەڵاوسانە بەرزەکەی سستییەکی زۆری هەبووە. بۆیەش نەدەکرا لیرەی ئیتاڵی بگاتە ناو سیستەمی دراوی ئەوروپی. لەگەڵ بوونی ئەو هەموو کێشە و تەنگژە ئابوورییە ئیتاڵیا توانی ببێتە یەکێک لەو وڵاتانەی بوونە دامەزرێنەری یەکەتیی ئەوروپی، زۆریش گیانبازانە گەیشتنە ناو بازنەی دراوی یەکگرتووی ئەوروپی.

# فراوانبوونی ئەوروپا

بۆ فـراوانکردنی یەکـەتیـی ئەوروپی کـۆمـیـسـیـۆنی ئەوروپی سێ مـەرجی سەرەکیی بۆ ئەو مەبەستە دانابوو، یەکەمیان یەکەتیی دراوی ئەوروپی کە دراوی یۆرۆ خـۆی دەنواند، پاشـان فـراوانکردنی یـەکـەتیـیـەکـە و دانـانی دەستوورێک بۆ ئەو یەکەتییە.

رۆمـانو سـەرکـەوتنی یەکـەتیـیـەکـە و دانـانی دراوەکـەی بە کـارێکی مـەزن زانیـوە، بەڵام ئەندامبـوونی وڵاتی تورکـیا لەو یەکـەتیـیـە بە مـەزندەی رۆمـانو بەرەو چارەسەرکردن دەڕوات، ئەو وا دەزانێت کەوا دەبێ تورکیا ببێتە ئەندام لەو یەکەتییەدا، بەڵام هیچ بەرواری دیاریکراوی بۆ دانەناوە، ئەوەش لە هەموو دیمانە و لێـدوانـی سـەرۆکـەکـانی ئەوروپی لە کـۆنگرە و کـۆبوونـەوە لووتکەییەکاندا دیارە.

بەڵام رۆمـانو لەو رۆژانەدا وا دەزانێت هـاتنە نـاوەوەی تورکـیـا بۆ ئـەو یەکەتییە بەئاسـان نازانێت، چونکە مەسـەلەکە ئاڵۆزیی تێ کەوتووە، ئەوەیان ئارامکردنەوەی رای گشتی لەسەر ئاستی ناوەوە و دەرەوەی دەوێت، هەروەها لەسەر ئاستی تورکیا و وڵاتانی ناو یەکەتییەکەش دەبێ سازکاریی بۆ بکرێت، چونکە رۆمـانو وا دەزانێت ئەو وڵاتە واتە تورکـیا لەو دەمانە کـێشـەی زۆرە و ئەسـتـەنگی لە پێـشـە، لەوانە فـراوانـیی رووبەری وڵاتـەکـە و هەمـەڕەنگی کولتوورەکەی، یان بەستنەوەی هەست و هۆشیاریی خەڵکەکە بە مێژووەکەیان، ئەگەر پەیامی یەکەتیی ئەوروپی بۆ وڵاتی تورکیا لەسەر بنەمای فرە بۆچوون و هێزی یەکەتییەکەیە، بەڵام دەبێ یەکەتییەکە هاوسەنگییەکە بپارێزێت و ناسنامەی تایبەتمەندیی هەبێت تا یەکەتییەکە لە داهاتوودا ببێتە هێزێکی یەکگرتوو لە سەدەکانی داهاتوودا.

# یەکەتیی ئەوروپا پێویستی بەویستی میللییەوە هەیە

دانانی دەستووری یەکەتیی ئەوروپی ستیەم هیوا و کارنامەی رۆمانو بوو لەو پێنج ساڵەی ئەو لە برۆکسل لە پۆستی سەرۆکایەتیی کۆمیسیۆنی ئەوروپی بوو. هەموو سەرکردە ئەوروپییەکان لەوە تێ گەیشتبوون کەوا یەکەتییەکە لەسەر بنەمای کارێکی نوێ دابرێژن.

رۆمانو وتوویەتی کەوا دەستووری ئەوروپی بەبایەخەوە باسی ئەو گرفت و کێشانەی کردووە کە لە ئەنجامی گلوبالیزمەوە پەیدا بوون کە پێشنیازی سەردەمێکی دیموکراسی گونجاوی کردووە بۆ ئەو قۆناخەی کە ئەوروپای تێدایە، ئەوەش بەپێچەوانەی ئەو بنەمایە کە نەتەوەکانی وڵاتەکان لەسەری دامەزراون، ئەوەش دەبێتە قۆناخێکی نوێ لە مێژووی هەموو ئەوروپا. بەئامادەبوونی نوێنەرانی هەموو وڵاتانی یەکەتیی ئەوروپی لە ئاهەنگێکی گەورەدا ئیمزا لەسەر دەستووری ئەوروپی کراوە، هەمووش رەزامەندیی تەواویان نیشان دابوو، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوورمان بوو کە دەستوورەکە بۆ پەسندکردن بڵاو کرایەوە، فەرەنسییەکان و هۆڵەندییەکان لە ئاکامی ریفراندۆمێکی میللیدا دەستوورەکەیان رەفز کردەوە.

دیارە کەوا ئەوروپا پێویستی بە پەیمانێکی هاوبەش هەیە، ئەوەش رامان و بۆچوونی رۆمانو پرودییە، دیارە ئەو وا دەزانێت ئەوەیان بە سەبر و خۆڕاگری و کاتی زۆرتر دەبێت، هەتا وڵاتانی ئەوروپا بخاتە سەر رایەڵەکە، ئەگەر ریفراندۆم لە سەرانسەری ئەوروپادا بەیەک رۆژ ئەنجام بدرێت ئەوا رۆمانو وا دەزانێ ئەوروپییەکان پەسندی دەکەن، چونکە لەو پرۆسەیەدا کەس ناتوانێ ببێتە رێگر لەسەر بوونی یەکەتیی ئەوروپی. میللەتانی ئەوروپا یەک دەنگن لەسەر بڕیارەکانی تایبەت بە مەسەلە نیشتمانییەکان و ئەوروپییەکان، ئەوان زیاتر رەوشە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەی ئەو رۆژگارەیان رەفز کردووە، نەک دەقی دەستوورەکە، رۆمانو وا دەزانێت کەوا رەزامەند بوون لەسەر یەکەتیی ئەوروپا ئیرادەیەکی میللی و ماوەیەک لە بیرکردنەوەی ورد و درێژی دەوێت.

بەشی کۆتایی

# ئەو بەردەوام لەگەڵ ئەوەدا بووە رەگی کریستانیەتی ئەوروپا دیار بکات

## پرودی نوێخواز بە ڕۆمانی براکانی کارامازوف

## سەرسام بووە

پێوەندیی نێوان کڵێسا و دەوڵەت لە ئەورووپا جێگەی دانوستاندنێکی گەورە بوو، ڕۆمانو هەر لە سەردەمی خوێندنی لە زانکۆدا لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا لە کۆتاییی پەنجاکان و سەرەتای شێستەکانی سەدەی رابردوو قسەیان لەسەر ئەو مەسەلەیە کردووە. پاش ئەوەی بە چڕی ئاخاوتنیان کردووە، دووبارە گەڕاونەتەوە سەر پرۆگرامی وانەکانیان، بەڵام خوێندکارەکانی بەشی فەلسەفە لە شرۆڤەکانیاندا بەردەوام دەگەڕانەوە سەر ئەو بابەتانەی وەک بیردۆز لە وانەکانیدا خوێندوویانە، ئەوەشیان لا پەسند بووە کەوا لە نێوان سەروەریی کڵێسا و سەروەریی دەوڵەت نێوانێک هەر هەبێت، بەڵام کەسانی تر هەبوون وایان دەزانی پشت بە شرۆڤە مێژووییەکان ببەستن، بۆیەش هەموو سەربردەکانیان شرۆڤە کردووە، واتە لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیتاڵییەوە تا ئەوەی گەشەی کردووە بۆ سیستەمێکی دیموکراسی پێوەست بە بەشداریی میللی لە سەدەی بیستەمدا.

ئەگەرچی خوێندکارە ئیتاڵییەکان لە بۆچوون و ڕاماندا جیاواز بوون، بەڵام بەردەوام قسەیان لەسەر کتێبەکەی ئارتورو کارلو جیمیلو (کڵێسا و دەوڵەت لەو سەد ساڵەی دوایی لە ئیتاڵیا) دەکرد، واتە لە پاش کۆتاییی حوکمی پاپا و چەسپاندنی هزری کڵێسایەکی ئازاد و دەوڵەتێکی ئازاد، تا کاتی دوورخستنەوەی کاسۆلیک لە ژیانی گشتی و گەیشتن بە ڕێکەوتنێک بۆ دووبارە بەستنەوەی کاسۆلیک لە حکوومەتی دیموکراتی ئیتاڵی لە پاش جەنگی دووەمی جیهانیدا.

ڕۆمانو زۆر سوودی لە کتێبەکەی جیمیلو وەرگرتووە و بەردەوام و تا

ماوەیەکی درێژ لە ناو کتێبخانەکەیدا هەڵی گرتووە، تا رۆژێکیان فلاڤیا بۆ خوێندنەوە کتێبەکەی لێ وەردەگرێت، کیژەکە ئەودەمانە لە قۆناخی دووەمی خوێندنی زانکۆ بووە، ئەو بۆ خوێندنی بابەتی مۆنۆگرافی بۆ تاقیکردنەوەی وانەی مێژووی هاوچەرخ سوودی لێ وەرگرتووە.

لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەن ململانێیەکانی ناو کڵێسای کاسۆلیک لەسەر مەسەلە گەورەکان سووکتر دەبێت، قەبارەی ئاژاوەکانیش کەم دەبێتەوە و جیاوازییەکانیش لە بۆچوونەکان دانوستاندنی لەسەر نامێنێت، پرشنگی دەمەقاڵییەکان و قسەکان نامێنێت.

پرودی وتوویەتی کەوا من گەیشتمە ئەو قەناعەتەی ئیتاڵییەکان بە شێوەیەکی ئامادەساز و چڕ و گونجاو ناتوانن رووبەڕووی کێشە نوێیەکان ببنەوە، بەتایبەتی ئەو کێشانەی لەو رۆژانەدا بەرووی کۆمەڵگەکەمان دەبوونەوە، ئەو دانوستاندنەی لە ناو جیهانی کاسۆلیک لەسەر سیکۆلار دەکرا رۆڵی ئەکتیڤی بینیوە لە گەشەی کۆمەڵگەی ئیتاڵیدا، ئەوەش دەگەڕێتەوە سەدەکانی یەکەمی سەرهەڵدانی کریستانییەت. وەزیفەی کڵێسا بەوە ناسراوە کەوا بە پەیامی (دیونەکان) بووە، ئەوەش پەیامێکی بێ ئیمزا بووە و لە سەدەی دووەمەوە تا ماوەیەکی کورت لە ناوەندە پسپۆڕەکان و لە بازنە سنووردارەکان ئەو دیونانە هەر مابوو. پەیامەکان بۆ کریستیانەکان جا ئەوانەی قەشە یان کەسێکی لانکی بوویێت بە هەردوو ئینتیماوە رێزگرتنی کڵێسا و دەوڵەت بووە. بە بۆچوونی پرودی بابەتە سەرەکییەکە ئێستا ئەو پێوەندییە نییە لە نێوان کڵێسا بە دەوڵەت، بگرە پابەندبوونەکە لە نێوان کریستیانییەت و دەسەڵات بووە، کە جۆری بیرکردنەوەکە لە پێوەندی نێوان رەوشت و حەق جیاوازە، هەر لەسەر ئەو بابەتە پرودی وتوویەتی:

دەبێ ئێمە ئەوەمان قبووڵ بێت کەوا گلوبالیزم وای کردووە کە دەوڵەت ناتوانێت کۆنترۆڵی دیاردەکان و کێشە گەورەکان بکات، کە سنووری جوگرافیای بڕیوە.

## عەلمانییەت و سیاسەت

پرودی وتوویەتی:

من لەو تێ گەیشتم کەوا ئەو دەرسانەی من لە ڕۆژانی خوێندنم لە کۆلێجی ئوکوستینیانیۆم باوی نەماوە، چونکە ئەوەیان بەکەڵک دامەزراندنی سیستەمی سیاسیی ئیتاڵی نەماوە و وا دیوارەکەی بەرلینیش رووخا و حزبە سیاسییەکانی ئیتاڵی پارچە پارچە بوون، ئێمەش لەو رەوشە نوێیەدا کارمان بۆ ئەوە کرد پرۆژەی ئۆلیڤۆ پێکهاتوو لە هەڤاڵبەندییەکی دیموکراسی بەبەشداریی چەندین بزاڤە چاکسازەکان ساز بکەین، لەوانە کاسۆلیکە دیموکراسخوازەکان و لایەنە ئابوورییەکانەوە تا کەسک و لیبرالییە دیموکراسییەکانی لەخۆ گرتبوو. بەبۆچوونی پرودی کۆکردنەوەی ناکۆکییە سیاسییە هەمەجۆرەکان لە ئیتاڵیا هاندەر بوو پرۆژەیەکی حکوومی بێتە پێشەوە، کە بەرنامەی زەمانەتی ڕێزگرتنی تەواوی بنەماکانی ئەخلاقی و ڕۆحی کە لە ناخی کۆمەڵگەی ئیتاڵی رەگ و ریشەیان هەبێت ئاسان نەبوو، بگرە زۆریش ئەستەم بوو، چونکە هەموو پرۆژەیەکی سیاسی تەنیا بە رەگ و ریشە و ئاسۆکانی بواری سیاسەت و ئابوورییەوە پابەند نییە و بەس، بۆیەش ئەو ماوەیەی لە پۆستی سەرۆکایەتیی کۆمیسیۆنی ئەورووپی بووە پشتی بە بنەماکانی ئەخلاقەوە دەبەستا. ئەویش ئەوەی کردووە، زۆریش رەخنەیان دەگرت کەوا بۆچوونەکەی بێ رۆح و بێ ناوەڕۆکە. پرۆژە ئەورووپییەکە پرۆژەیەکی سیاسیی سەردەمەکەیە، کە تاکە ئامانجی ئاشتی بووە، ئەوە و چەمکێکی نوێ بۆ ژیانی مەدەنی و سیاسی داناوە کە بتوانێت سستی و سنووری دەوڵەتی نەتەوە دەرباز بکات.

## رەگەکانی کریستیانییەتی ئەورووپا

بەئاسانی ناکرێ مێژووی بنیاتنانی یەکەتیی ئەورووپی کورت بکرێتەوە و باس لە ڕۆڵی پێشەنگی مەزهەبە ئاینەکان بکرێت کە هاندەر بوون لە کەشەی

بیرکردنەوە سەبارەت بە رەگەکانی رۆحی کیشوەری ئەوروپی، کە ئەو باوکانە دو گاسبیری و رۆبرت شومان و کونراد ئادیناور رۆڵیان لە بەرجەستەبوون هەبووە.

ئەو مەسەلەیە لە دوا قۆناخەکانی سەرۆکایەتیی رۆمانو پرودی لە سەرۆکایەتیی کۆمیسیۆنی ئەوروپی بایەخێکی زۆری پێ درابوو، جا چ لە مەسەلەی دەرکردنی پرۆژەی دەستووری ئەوروپی یان لەسەر ئاستی رای گشتی کە کۆشش دەکرا مەرجەعییە ئاینەکان بەشدار بکرێت، تا داواکەی جۆن پۆلی دووەم لە رەگەکانی کریستیانییەتی ئەوروپادا بەرجەستە بکرێت.

رۆمانو وتوویەتی کەوا ئەو بەردەوام ئاماژەی بەو بیرۆکەیە داوە، کە مەدلوولی بابەتییانەی لە تەک لایەنی ئەساسییەکانی کولتوور و رۆحیەتی ئەوروپادا هەبووە، بەمەرجێک رۆڵی ئاینی کریستیانی لە کیشوەری ئەوروپا پشتگوێ نەخستووە، ئەوەش بۆ ئەو جەوهەری بووە و بۆیەش پێویست دەکرا لە زۆر لایەنەوە جووڵەی بۆ بکرێت.

مەرجی پەسندکردنی دەستووری ئەوروپی قبووڵکردنی هەموو گەلانی ئەوروپی بوو، بەڵام مەسەلەی پەسندکردنەکە تا ئیمرۆش لەسەر فرەنسا و هۆڵەندا ماوەتەوە، کە ئەو دوو میللەتە رەفزی ئەوە دەکەن ئەوروپا بە دەستوورێکی لەو جۆرە و لەو پێکهاتە حوکمیان بکات، ئەو دوو وڵاتە رەگی سیکۆلاری تێدا قووڵ بوویتەوە و سیاسەت هەموو ئەزموونە ئاینییەکانی هەژاندووە، چونکە ئەوروپاییەکان لەو رۆژگارەدا بەتایبەتی بایەخدانی زۆر بەو سنوورە دەدەن کە بکرێتە سەر وەزیفەکانی ئاین، ئەوەش لە بیر دەکەن کەوا بوار بۆ ژیانی گشتی ساز بکەن.

رۆمانو پرودی لەسەر پسوولەیەکدا پێشنیازێکی بۆ شیراک دەنووسێتەوە کەوا تێیدا نووسرا بوو دەکرێ برگەیەکی ئەو مادەیە هەموار بکرێت کەوا پێوەستە بە رەگەکانی مەسیحییەت لە ئەوروپا، کە شیراک ئەو پێشنیازە دەخوێنێتەوە بە رۆمانو دەڵێت کاغەزەکە لە گیرفانت دابنێوە و ناوەڕۆکەکەی رەفز دەکات، چونکە لە وردەکارییەکانیەوە رافەی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی

رۆژانەی ژیانی فرەنسای کردبوو، لە راستیدا پێشنیازەکە لەگەڵ بنچینەکانی ئەورووپای نوێدا نەبووە، بگرە تەنیا لەگەڵ مێژووی فرەنسادا بووە.

رۆمانو باسی لە پرەنسیپەکانی دەستووری ئەورووپی کردووە، لایەنەکانی تایبەت بە دان پێدانان بە مافی تاکەکان یان کۆمەڵگە و پاراستنی کەمینەکان و لەوانەش دوورتری راڤە کردووە، کە هەموو ئەوانە لە ناخەوە لە مەسیحییەت رەگیان هەبووە، کەوا کریستیانییەت بەرەنجامەکانییەتی، ئەگەر وەک مەرجەعییەتیش قبووڵیان نەبێت و پێوەندی بەو رەوشەی ئیمڕۆش نەمابێت، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر کۆنە ململانێیەکانی و ناکۆکییەکانی زووتر لە ئەورووپادا بوونیان هەبووە، دیارە ئەوانەش بە یەکەتیی ئەورووپی دەکرێ بنبڕ بکرێن و نەمێنێن.

ئەگەر رۆمانو بۆی نەچووبێتە سەر کەوا رەگەکانی مەسیحییەت لە ناو دیباجەی دەستووری ئەورووپی دانێت، ئەو توانیویەتی ئەوەیان لە مادە ٥٢ دان بەراستیبوونی کڵێسا و رێکەوتننامەکان بنێت کە وڵاتانی ئەندام لە یەکەتییەکە کردوویانە، هەروەها دانیش بەو مادەیە نراوە کەوا کڵێسا وەک نوێخواز و دانوستانکەرێکی ویستراو لە ناو دەزگاکانی یەکەتیی ئەورووپی بوونی هەبێت، ئەوەش لەلایەن پرودی ناو نرابوو (دیالۆگی نوێگەرانە) هەنگاوێکی گەورەیە بە بەراورد بە رابردوو و بە هەموو پەیمان و دەستوورەکانی وڵاتانی یەکەتیی ئەورووپی.

رۆمانو وتوویەتی کەوا دیالۆگ و دانوستاندن سەبارەت بە رەهەندی رۆحی ئەورووپا، لە ئەنجامی دیمانە تایبەتییەکانی دانانی دەستووری ئەورووپی نەبووە، بگرە لە ئەنجامی توێژینەوەی زۆر بووە کە پێشتر و لەساڵی ٢٠٠٢ تیمی کاریان هەبووە و بە وریایی کاریان کردووە بۆ دۆزینەوەی ئاسۆکانی کولتووری و رۆحی بۆ ئەورووپای نوێ.

## سادەیی فلاڤیا

فلاڤیا لەبەر نووسینی ئەو کتێبە رووی لە چەندین لایەن و رووداو کردیتەوە، رۆژانی خوێندنی بەبیر خۆی هێناوەتەوە و باسی ماڵ پاککردنەوە و سەردانی قوتابخانە و مامۆستاکانی هەردوو کوڕەکانی کردووە و لەو کتێبەش دیارە کەوا ئەو خۆی بازاڕی کردووە، بەردەوام داپیرەکەشی بردووەتە نەخۆشخانە، لە کۆبوونەوەکانی کڵێسا بەشدار بووە، ئەو ژنە نووسیویەتی کەوا لە دیمانە رەسمییەکان و خوانەکانی ئێواران لەگەڵ مێوانە بێگانەکان بە زمانی تریش پەیڤیوە. ئەو زۆر شەیدای پیشەی مامۆستایەتی بووە، چونکە ئەو وای دەزانی کەوا بەو کارە دەتوانێت باوەڕ و هزرەکانی بگەیێنێتە کەسانی بەرامبەری و سازکاری بکات تا خەڵک فێر بکات.

فلاڤیا زەحمەتیی دیوە لەوەی هاوسەنگییەک لە نێوان پەروەردەکردنی منداڵەکان و دابینکردنی پێویستییەکانی ناوماڵ و ژیانی پیشەیی ساز بکات، چونکە ئەو دەبووایە سەفەر بکات، کۆشش بکات زمانی بێگانە فێر بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کاتی تەرخان کردبوو بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکان و پێوەندییەکانی ناو کڵێسا و تیمی تۆپی باسکە و دۆستایەتی لەگەڵ هاوڕێیەکانی، لەولاشەوە باوکەکە کارکەر بوو لەوەی منداڵەکان هان بدات، وەک چۆن لە زانکۆدا کۆششی بۆ خوێندکارەکانی دەکرد. هەردوو کوڕەکەی لە زانکۆی بێگانە خوێندنیان تەواو کردووە، ئەوەش لەسەر زاری فلاڤیاوە باس کراوە، بەڵام ئەوان تا پەنجەکانی پێیان بە هاووڵاتییەکەی شاری پۆڵۆنیا دەژمێرن و ماڵ و خێزان و کاریان لە ئیتاڵیایە.

رۆمانو لەو کاتەی لەگەڵ فلاڤیا بەدەستگیران بوون وێنەیەکی کاریکاتێری دەستکردی شولتزی بەناوی (ئەوەیە ئاسایش) پێشکێش کردووە، بۆیەش فلاڤیا بەو شێوەیە قسەی لەسەر ئاسایش کردووە:

ئاسایش لە دیدی شرویدر داخستنە لە ناو قوودییەکی پارێزراوی دوورەپەرێز، بەڵام سەبارەت بە خەڵکی تر ئەوانەی برایەکی گەورە یان

یەکێکیان هەبێت پشتیوانیان بێت، یان کەسێک ئامۆژگارییان بکات.

ئەوان بەیەکەوە و لەگەڵ کوڕەکانیان رێک کەوتوون لەسەر ئەوەی بە دەستی پارەی رۆژانە و مانگانەیان نەدەنێ، بگرە بڕێک پارەیان لە ناو کووپێک داناوە و کووپەکەیان لەسەر دۆلابێکی ژووری دانیشتن بۆ ئەوان داناوە. ئەوان بۆیان هەبووە پارەی خواردنی پیتزایەک ببەن، یان ساردەمەنییەک بەو پارەیە بخۆنەوە، حەقی ئەوەیان هەبووە پارەی پلیتی بینینی فیلمێک لەو کووپە هەڵگرن، دایکیان لە مەسرەفی هەردوو کوڕەکەی رازی بووە، کەوا ئەوان پارەی زیادیان نەبردووە، کە رۆژانەی پشوودانیان هەبووە، لەو رۆژانەدا پارەی زۆریان سەرف نەکردووە، ئەوان بەتەواوی سەربەخۆیی خۆیان هەبووە، یەکێکیان پارچە پارەی گچکەی لە دەستی داپیری وەرگرتووە، کە ئەو پارەی نەماوە و کاتی چوونە بانکی نەبووە دەخیلەکەی شکاندووە و وردەکانی دەرهێناوە و لەو پارەیەش بەشی ئەوانی دەدا، ئەوانیش بەو کارەی داپیرەیان سەرگران نەدەبوون.

## پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر سیاسەت

فلاڤیا کارکەر بووە تا گەنجەکان روو لە سیاسەت بکەن، لە بەرنامەکانی کار و قوتابخانە و پشوودانەکانیان روو لە سیاسەت بکەن، چونکە گەنجانی ئەو رۆژگارە لەوانە بێ ئاگان، هەروەها سەبارەت بە پەروەردەی ئاینیش، ئەو وا دەزانێت کەوا ئاین رۆڵی دەبێت لە پەروەردەی منداڵان و بڕوایان پتەو دەکات، بەوەش رێزی سەرکردەکانیان دەگرن و بە خوێندنەوەش ئاسۆی کولتوورییان قووڵ دەبێت.

لە کتێبخانەکەیان چەندین جۆر کتێب هەبووە، زۆریان کتێبی کۆنن کە تایبەتن بە ئابووری و زانستە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوانەش ژن و مێردەکە لە کاری رۆژانەیان کاریان بەو جۆرە کتێبانە هەبووە و وەک سەرچاوە بەکاریان هێناون. فلاڤیا دەڵێت، پرودیی مێردم زۆر ئامۆژگاریی گەنجەکانی کردووە بەوەی رۆمانی برایانی کارامۆزفی دیستۆفسکی رووسی بخوێننەوە، چونکە

ئەو رۆمانە رووسییە زۆر نموونەی لەسەر ململانێ و ناكۆكیی نێوان خێر و شەڕ تێدایە، ئەگەرچی ئامۆژگارییەكی پیاوەكەی لەلا سەیر بووە، بەڵام ئەو كتێبەكانی سەردەمی گەنجی رۆمانۆی خوێندیتەوە، ئەو زۆر كتێبەكانی تۆلستۆی و تورجینییف و پاسترناكی خوێندووەتەوە، كە بەیەكەوە بوونەتە هاوسەر پیاوەكە هانی ژنەكەی داوە شاكارە ئەدەبییەكانی فەرەنسی و رووسی بخوێنێتەوە.

لە سەردەمی رۆمانۆ ئامێری تەلەڤزیۆن كەم بووە، بۆیە زۆرتر رووی لە خوێندنەوەی كتێب كردووە و كتێبیش تاكە سەرچاوەی زانیارییەكان بووە، بەڵام لە سەردەمی ژنەكەی وا نەبووە ئامێری تەلەڤزیۆن زۆر بووە و كەمتر ئەوان روویان لە كتێب كردووە.

ئەگەرچی رۆمانۆ زۆر شەیدای كتێب بووە و حەزی كردووە هەردوو كوڕەكەی هۆگری خوێندنەوە بن، بەڵام لەوەدا بۆی نەكراوە و سەرنەكەوتووە، فلاڤیاش ئەوە بە گۆڕانی زۆری نێوان نەوەكان دەزانێت، ئەوەش پاش ئەوە هاتووە كە شۆڕشی تەكنۆلۆجیا زۆرتر گەشەی كردووە و دنیای گۆڕیوە بە گوندێكی گچكە، ئەوەش هەموو رۆڵی زۆریی ئەنتەرنێت بووە لەو بوارەدا، بەڵام ئەو سوورە لەسەر ئەوەی دەبێ هاوسەنگی لە نێوان نوێگەری و ئەزموونە مرۆڤایەتییەكەدا هەبێت، ئەوەی جێگەی رامان و هەڵوەستەیە كەوا رۆمانۆ پرودی هانی خەڵكی داوە رۆمانی براكانی كارامازوف بخوێننەوە، بەڵام ئەو خۆی كاری كردووە و ژیانی بۆ ئەوە تەرخان كردووە هەموو بەرەو نوێگەری و نوێبوونەوە رێ بكەن.



فلاڤیا بە منداڵی و لە باخچەی ساوایان




فلاڤیا لەگەڵ هاوسەرەکانی سەرانی یەکەتیی ئەورووپادا



رۆمانۆ و ڤلاڤیا



ڤلاڤیا لەگەڵ هیلاری کلینتۆن

